

عەزیز نەسین

# تورک لە بولگارستان
# کورد لە تورکیا

وەرگێڕان و ئامادەکردنی
بەکر شوانی و سیروان رەحیم

پرۆفیسۆر جەبار قادر
پێشەکی بۆ نووسیوە

هەولێر ٢٠١٠

**پێشکەشە بەو زانیارەی تەنها لە پێناوی زانست و راستیدا بەرگری لە کورد و کێشەی کورد دەکات..**

**بەو زانیارەی ئامادە نییە وڵاتەکەی بە جێ بهێڵێت و بەرگریکردن لە تێگە و بۆچوونەکانی بە کەسانی دیکە بسپێرێت..**

**زانیارێك بە هەموو وزەیەکییەوە دەیان ساڵە بەرانبەر بە چەواشەکاری و دژەزانست خۆی راگرتووە و دەزانێت زانست و لۆژیك سەردەکەون..**

**پێشکەشە بە**

**ئیسماعیل بێشکچی..**

# پێڕست

# پێشەکیی پرۆفیسۆر دکتۆر جەبار قادر

عەزیز نەسین یەکێ لە نووسەرە هەرە بەنێوبانگەکانی سەدەی بیستەمی تورکیایە و دید و بۆچوونەوەکانی گرنگی زۆریان پێدراوە ، بە تایبەتی ئەگەر لە بارەی پرسێکی هەستیاری وەکو دۆزی کوردەوە بووبێ لەو ولاتە. رەنگبێ وتەکانی عەزیز نەسین بە پێوەرەکانی ئەورۆ مایەی سەرنجێکی زۆر نەبن، لێ بۆ ئەو رۆژانەی نەسین ئەو قسانەی کرد لە بارەی دۆزی کوردەوە کرد ئازایی و جوامێرییەکی بێ وێنە بوو، تەنها ئیسماعیل بێشکچی لەو بوارەدا لە پێش ئەوەوە بوو.

پێش ئەوەی باسی دید و بۆچوونەکانی لە بارەی دۆزی کوردەوە بکەین و لێکدانەوەیان بۆ بکەین، ئەگەر بە کورتیش بێ وێستگە سەرەکییەکانی گەشتی ژیانی ئەم نووسەرە گەورەیە بخەینە بەر دیدی خوێنەری کورد .

نووسەری بەنێوبانگی تورك عەزیز نەسین ( نێوی راستەقینەی محەمەد نوسرەت کوری عەبدولعەزیز نەسین) لە 20 کانونی یەکەمی ساڵی 1915 لە دوورگەی هەیبەلی لە ئیستانبوڵ هاتۆتە دونیاوە و لە 5 تەمموزی 1995 کۆچی دوایی کردووە . بە پێی ئیندێکسی یۆنیسکۆ بۆ بەرهەمە وەرگێردراوەکان عەزیز نەسین بە پلەی چوارەمین دێت لە نێو ئەو نووسەرە تورکانەدا کە بەرهەمەکانیان وەرگێڕدراون بۆ چەندین زمانی دیکە. ئەم ئیندێکسەی یۆنسکۆ لە ساڵی 1932 هاتۆتە کایەوە ونێوی ئەو کتێبانەی تێدا تۆمار کراوە کە وەرگێڕدراون بۆ زمانی تر. ئەو بەرهەمانەی پێش ساڵی 1979 وەرگێردراون لە ئیندێکسی کاغەزیدا لە چەشنی کتێبدا بلاّو کراونەتەوە و لە کتێبخانە گرنگەکانی جیهان دەست دەکەون . بەرهەمەکانی دوای ساڵی 1979 لە داتابەیزێکدا تۆمار کراون کە ملیۆنێك و نۆسەد هەزار ناونیشان دەگرێتە خۆ.

عەبدولعەزیزی باوکی لە گیرەسۆنەوە هاتبووە ئیستانبول وبەکاری باخەوانییەوە خەریك بوو بۆ بەخێوکردنی ژن و منداڵەکانی. بە وتەی یەکێك لە نەوەکانی، عەبدولعەزیز شەیدای سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و دوژمنی باوەکوشتەی موستەفا کەمال بوو .

عەزی نەسین لە ساڵی 1924 لە (مەکتەبی ئیبتدائی سوڵتان سولەیمانی قانونی) کە نێوەکەی گۆردرا بۆ قوتابخانەی 7 ئیستانبوڵ لە پۆلی سێ وەرگیرا . دوای دوو ساڵ خوێندنیش لە لیسەی دارولشەفەق چووە لیسەی سەربازی قولەلی لە ساڵی 1935 و لە ساڵی 1937 قوتابخانەی جەنگی ئەنقەرەی تەواو کرد و بوو بە ئەفسەری یەك ئەستێرە. لە ساڵی 1939 قوتابخانەی هونەری سەربازی تەواو کرد. لە هەمان کاتدا لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان لە بەشی زەخرەفە دەیخوێند.

وەکو ئەفسەر لە سوپای تورکیا لە چەند دەڤەرێکی تورکیا خزمەتی کرد لە دەسپێکی شەڕی دووەمی جیهانیدا دوو ساڵ ژیانی لە خێوەتگەی سەربازیدا لە تراقیا بەسەر برد. لە 1942 گوێزرایەوە بۆ ئەرزەرۆم و هەر لەوێ لە تەقینەوەی بۆمبێکدا بریندار بوو . لە ئەرزەنجانیش بۆ گواستنەوەی جبەخانەی سوپا لە دوای بومەلەرزە ماوەیەك دەست بە کار بوو. لە ساڵی 1944 لە یەکەمین کۆرسی کارکردن لە سەر تانك لە قوتابخانەی جەنگی ئەنقەرە بەشداری کرد. بۆ ماوەیەکیش لە سەر موشەکی دژ بە فرۆکە لە زەنگولداغ دەست بەکار بوو . هەر لەو دەور و بەرە بە تۆمەتی (خراپ بەجێهێانی ئەرك وکارەکانی) لە سوپا دوورخرایەوە.

لە دوای دوورخستنەوەی لە ریزەکانی سوپا دەمێك بە بەقاڵی و ژمێریارییەوە خەریك بوو. لە ساڵی 1945 دەستی بە رۆژنامەوانێتی کرد. لە دەسپێکدا چووە گۆڤاری (یەدی گوین - حەوت رۆژ) کە سەدات سەماوی

**دەریدەکرد . دوای ئەوەش لە رۆژنامەی (قەرەگوێز) وەکو نووسەر و ریداکتۆر کاری کرد. هەر لە هەمان ساڵدا دەستی کرد بە نووسینی شانۆ و گۆشەی تایبەت بۆ رۆژنامەی (تان). لە ساڵی 1946 لە گەڵ کۆمەڵێ گەنجی زانکۆ بڵاوکراوەیەکی هەفتانەی بە نێوی (شەممو) بلاوکردەوە، کە تەنها هەشت ژمارەی لێ دەرچوو. لە دوای ئەوەش لە رۆژنامەی (وەتەن) دەستی بەکار کرد. هەر لە هەمان ساڵدا یەکەمین نامیلکەی لە 16 لاپەرەدا بڵاوکردەوە لە ژێر ناونیشانی ( پارتی دامەزراندن و پارتی لێدان) .**

**لە ساڵی 1946 دا لە گەڵ سەباحەدین عەلیدا رۆژنامەی ساتیری (مارکۆپاشا)ی دەرکرد و دەنگێکی زۆری دایەوە. بە رەخنە و ساتیرەکانی مارکۆ پاشا سیاسەتمەداران و کاربەدەستانی تووڕە دەکرد و چەندین جار بە داخستنیان دا، لە گەڵ ئەوەشدا ژمارەی فرۆشی هەر لە بەرزبوونەوەدا بوو. ئەو دۆزانەی لە دژی مارکۆ پاشا و نووسەرانی دەکرانەوە ژیانیانی رۆژ لە دوای رۆژ سەختتر دەکرد. عەزیز نەسین بە هۆی نووسینێکەوە لە ژێر ناونیشانی (بەرەو کوێ دەرۆین؟)، کە رەخنەی لە پەیوەندییەکانی تورکیا و ئەمەریکا دەگرت، لە 12 ئابی 1947 سزای 10 مانگ زیندانی گرانی بۆ بڕایەوە و دەبوایە سێ مانگ و دە رۆژیش لە ژێر چاودێری توندی ئەمندا بە دوورخراوی لە بورسە بەسەر بەرێ .**

**دووەمین بەرهەمی عەزیز نەسین کتێبی (عەزیزنامە) بوو کە ساڵی 1948 بڵاوکرایەوە. بە هۆی رەخنە و ناوەرۆکی ئەم کتێبەوە لە دادگای 2 سزای گرانی ئیستانبوڵ دۆز لە دژی کرایەوە. هەرچەندە ئەو دادگایە لە سەر ئەم بەرهەمەی سزای بۆ نەبڕیەوە، لێ بە هۆی گازندەی شازادەی بەریتانیا ئەلیزابێس، شای ئێران محەمەد رەزا پەهلەوی و شای میسر فاروقەوە لە رێگەی باڵیۆزخانەکانیانەوە لە ئەنقەرە، کە بە فەرمی سەردانی وەزارەتی دەرەوەی تورکیایان کرد و دۆزیان لە دادگای ئەنقەرە لە دژی کردەوە، شەش مانگ زیندانی بۆ بڕایەوە . ئەو هەموو سەرئێشەیە ناچاری کرد پەنا بۆ کار و پیشەی تر بەرێ بۆ بەخێوکردنی ماڵ و منداڵەکەی. لە ساڵی 1952 لە گەرەکی لەڤەنت لە ئیستانبوڵ دوکانێکی بە کرێ گرت و دەستی کرد بە کتێب فرۆشتن. لە گەڵ کتێب فرۆشتندا بەیانیان رۆژنامەی بە سەر دانیشتوانی لەڤەنتدا دابەش دەکرد. بەڵام بۆی نەکرا بەو کارە پێداویستییەکانی هەردوو منداڵە بچوکەکەی دابین بکات، بۆیە لە ساڵی دواتردا دەستی لەو کارەش هەڵگرت و لە گەرەکی بەیئۆغلۆ ( ستۆدیۆی فۆتۆغرافی پارادی ) کردەوە. ئەم کارانە نەیانتوانی لە نووسین و بڵاوکردنەوە دووری بخەنەوە، لە ساڵی 1954 دا بە نێوی خوازراوەوە لە گۆڤاری (ئاك بەبە) دەستی بە نووسین کرد.**

**لە 6 و 7 ئەیلولی 1955 کارەساتی تالانکردنی ماڵ و فرۆشگەکانی کەمینە ئاینییەکان وتوند و تیژی لە دژیان لە ئیستانبوڵ قەوما ، لەو دوو رۆژەدا نەژادپەرستان و تاوانکاران ماڵ و سامانی کەمینەی یۆنانی و ئەرمەنییەکانیان بەتالان برد و زەبر و زەنگی زۆریان لە بەرامبەریان ئەنجامدا. ئەم رووداوەش یەکێ لە پەڵە رەشەکانی تری مێژووی هاوچەرخی تورکیایە. دوای ئەوەی تاوانکاران تاوانەکانی خۆیان ئەنجامدا، ئەوجا هێزەکانی ئەمن و ئاسایش کەوتنە گرتنی خەڵك. سەیر لەوەدایە کە لەو رووداوەدا عەزیز نەسین بە تاوانبار لە قەڵەم درا و دەستگیر کرا.**

**ساتیر و ریپۆرتاژ و بیرۆکەکانی عەزیز نەسین کە لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی وەکو (دۆڵمش) 1955، (یەنی گەزەتە) 1957، (ئەکشام) 1958 ، (تانین) 1960، (گوین ئایدن) 1969 و (ئایدنلك) 1993، بڵاو دەکرانەوە، ئەم نووسەرەیان کرد بە یەکێ لە نووسەرە هەرە بەنێوبانگەکانی تورکیا.**

له پای بەرهەمە نایابەکانی و نێوەرۆکە ئینسانیەکەی کۆمەڵێ خەلاتی نێودەوڵەتی وەرگرت. خەلاتی چڵە خورمای زێڕینی ئیتالی لە 1956 لە سەر ساتیری ( ئاهەنگی قازان). بۆ ساڵی دواتریش لە پای ساتیری (حەمدی فیل) هەمان خەلاتی وەدەستهێنا.

لە ساڵی 1956دا لە گەڵ بیرمەند و رۆماننووس کەمال تاهیر وەشانخانەی (بیر) یان دامەزراند. 1963 بە هۆیەکی نادیار ئەو وەشانخانەیە سوتا و لە ژێرزەمینەکەیدا ژمارەیەکی زۆر کتێب سووتا، کە نرخەکەی دەگەیشتە نزیکەی سێ ملیۆن لیرە ( بە نرخی ئەورۆ دەیکردە نیو ملیار لیرە ). دوای ئەوە عەزیز نەسین خۆی بە تەواوی بۆ نووسین تەرخان کرد.

لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا، واتە لە ساڵی 1965دا پاسپۆرتی بەدەستهێنا و توانی گەشتێك بۆ دەرەوەی تورکیا بکات. لەو گەشتەیدا کە شەش مانگی خایاند، ئامادەی فیستیڤالی نووسەرانی دژە فاشیست بوو لە بەرلین و ڤایمار. دوای ئەوەش سەردانی پۆڵۆنیا، یەکێتی سۆڤیەت، رۆمانیا و بولگارستانی کرد.

لە ساڵی 1966 خەلاتی زێڕینی ژوژیکی لە بولگارستان بەدەستهێنا. لە ساڵی 1968 خەلاتی یەکەمی رۆژنامەی میللییەت و لە ساڵی 1969 لە مۆسکۆ خەلاتی یەکەمی (کرۆکادیل) و لە ساڵی 1970 خەلاتی کۆری زمانی تورکی وەرگرت .

یەکێ لە کارە گەورەکانی عەزیز نەسین دامەزراندنی وەقفی نەسین بوو لە ساڵی 1972 هەموو ساڵێ چەند منداڵێکی بێ کەس و دەرەتانی دەگرتە خۆ و لەو وقفە بەخێویانی دەکرد و دەیانی ناردە بەر خوێندن و هەموو خەرجییەکانیانی دەگرتە ئەستۆی خۆی تا خوێندنیان تەواو دەکرد و دەیانتوانی لە سەرپێی خۆیان راوەستن و هەموو داهاتی کتێبەکانیشی بۆ ئەو دامەزراوە خێرخوازییە تەرخان کرد. ئەو دامەزراوەیە تاوەکو ئێستا دەیان منداڵی بێ کەس و کاری پێگەیاندووە ویەکێ لەو شتە مەزنانەیە کە عەزیز نەسین لە پاش خۆی بۆ کۆمەڵگەی تورکیی بەجێی هێشتوون.

لە ساڵانی 1976- 1980 ساڵانە ساڵنامەی ئەدەبیاتی وەقفی نەسین بلاو دەکرایەوە کە گوڵبژێرێك لە بەرهەمە ئەدەبیەکانی دەگرتە خۆ.

ساڵی 1974 خەلاتی (لۆتوس)ی یەکێتی نووسەرانی ئاسیا و ئەفریقای وەرگرت و بۆ وەرگرتنی خەلاتەکە لە ساڵی 1975 چووە مانێلا پایتەختی فلیپین. لە ساڵی دوای ئەوەش خەلاتی (هیتار پیتەر)ی بولگاری پێ بەخشرا. لە ساڵی 1977 بە سەرۆکی سەندیکای نووسەرانی تورکیا هەڵبژێردرا و بۆماوەیەکی دوور و درێژ و بۆ چەندین جار بۆ ئەو پۆستە هەڵبژێردرایەوە .

لە 1982 لە کاتی گەرانەوەیدا لە کۆبوونەوەی یەکێتی نووسەرانی ئاسیا و ئەفریقا لە ڤیەتنام لە مۆسکۆ تووشی نەخۆشی دڵ هات و بۆ ماوەی مانگێك لە (سەنتەری لێکۆڵینەوەی نەخۆشیەکانی دڵ) تیمار کرا.

لە ساڵی 1983 بانگهێشت کرا بۆ زانکۆ ئیندیانا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەلام لە بەر ئەوەی پاسپۆرتەکەی لێ کێشرابووەوە، نەیتوانی بەشداریی لەو بۆنەیەدا بکات. لە 20 کانونی یەکەمی 1984 لە ساڵۆنی سینەمای شان ئاهەنگی حەفتا ساڵەی لە دایکبوونی بۆ گێڕدرا . لە هەشتاکان و لە دوای کودەتای سەربازیش لە 12 ئەیلولی 1980 عەزیز نەسین چالاکانە بەشداریی هەڵمەتەکانی رۆشنبیران و رۆژنامەنووسانی دەکرد لە پێناو مافەکانی مرۆڤدا و ئیمزای خۆی دەخستە سەر بەیاننامە و بیرخەرەوەکان بۆ ئەو مەبەستە و لە زۆر کۆبوونەوە و رێکخراوی دیموکراتی و چاودێریکردنی دیموکراسی بەشداری دەکرد و خەلاتی نیشتمانی و نێودەوڵەتی بەدەست دەهێنا .

له 19 مارتی 1990 له ئەكادیمیای هونەری ئەنقەره 75 ساڵەی عەزیز نەسین به ئامادەبوونی خۆی پیرۆز كرا و له 3 تەممووزی 1993 بۆ بەشداری كردن له ئاهەنگی پیرعەبدالّ چووه شاری سیواس و رزگاربوونی له مردن له ئاگر كەوتنەوەی ئوتێلی مادیماك لەو شاره مایەی سەرسورمان بوو. لەو رووداوه دڵتەزێنەدا 35 رۆشنبیر و هونەرمەندی توركیا ژیانیان له دەستدا. سێ رۆژ له دوای یادكرنەوەی سێ ساڵەی ئەو كارەساتەی سیواس و له شەوی پێنج له سەر شەشی تەممووزی 1995 دڵی گەورەی عەزیز نەسین له لێدان كەوت و به پێی وەسێتی خۆی به بێ مەراسیمی فەرمی و كۆبوونەوەی جەماوەری  له 7 تەمموز له باخچەی وەقفی نەسین له چاتاڵجه به خاك سپێردرا .

گرنگترین بەرهەمەكانی عەزیز نەسین بریتین له 47 كتێبی كورتەچیرۆك، 10 رۆمان، 5 یادداشت، 5 ئەفسانە، یەك كتێبی هەجو، 6 كتێبی بیرۆكه ، دوو گەشتنامە، 12 شانۆگەری، 7 دیوانی شیعرو  دوو بەرگیش بریتین له وته و گوتارەكانی له كۆبوونەوه و بۆنەكاندا .

كرۆكی ئەم كتێبەی له بەردەستی خوێنەری ئازیزدایە، وەڵامی عەزیز نەسینه بۆ پرسیاری گۆڤاری (ئیكیبینه دۆغرو - بەرەو ساڵی دووهەزار) دەربارەی دۆزی كورد له توركیا له 1987دا. له وەڵامدا عەزیز نەسین بیر و بۆچوونی خۆی له بارەی دۆزی كوردەوه خستۆته روو. بەر له هەر شت ئەو رەخنه لەو قانونانه دەگرێ كه نكۆڵی له كورد دەكەن و بوونەته كۆسپ له رێگەی چارەسەركردنی ئەم دۆزەدا. تەنانەت ئەو ئەورۆش دوای ئەو هەموو گۆرانكارییه له دەستوری ساڵی 1982، هێشتا ئەو دەستوره و قانونەكانی توركیا رێگری گەورەن له بەردەم چارەسەری دۆزی كورددا. بەر له نزیكەی چارەكه سەدەیەك عەزیز نەسین دەڵێ دەمی ئەو قانونانه بەسەر چووه و پووكاوەنەتەوه و دەبێ بگۆردرێن. هەرچەندە عزیز نەسین له دژی شەری چەكداری بووه و ئەو رێگەیەی به رێگەیەكی باش نەزانیوه و ترسی لەوه هەبووه بۆچوونەكانی به خراپی لێكبدرێنەوه، لێ به شێوەیەك له شێوەكان ئاماژەی بەو راستییه كردووه كه حكومەت هەموو رێگەكانی له بەردەم خەباتكارانی كورددا داخستووه و تەنها رێگەی پەنابردنه بەر چەكی له بەردەمدا هێشتوونەتەوه .

هەر لەو وەڵامەدا عەزیز نەسین داوا دەكات ددان به هەبوونی كوردا بنرێت و دەسەڵاتداران دەست له سیاسەتی نكۆڵیكردن له گەلی كورد هەڵگرن و واز لەو هەوڵانه بێنن گەلی كورد له چوارچێوەی توركدا ببینن، راستتر بتوێننەوه. ئەم وتانه بۆ وڵاتێك كه تاوەكو ئێستاش ددان بەوەدا نانێ كه كورد گەلێكی یا تەنانەت گروپێكی ئەتنیكی سەربەخۆیه و هەوڵی زۆر دەدرێ له چوارچێوەی گەلی توركدا، نەك گەلی توركیادا، هەڵسوكەوتی له گەڵدا بكرێ، دەڵێین ئەم وتانه بۆ وڵاتێكی وا و بەر له بیست و سێ ساڵ هەڵوێستێكی مەردانه بوو .

عەزیز نەسین داوای دەكرد ددان بندرێ به ماف و سەربەخۆیی كولتوریی كوردا و له هەڵوێستیدا نەگەیشتبووه رادەی ددانئان به ماڤی سەربەخۆیی سیاسی و نەتەوەیی كورد. لەمەدا زۆر له دوای ئیسماعیل بێشكچیەوەیه بوو، كه له دژی هەڵوێستەكانی عەزیز نەسین و سەندیكای نووسەرانی تورك، كه نەسین سەرۆكایەتی دەكرد زۆری نووسیوه .

عەزیز نەسین دەیوت وڵات بارێكی ئارامتری دەوێ بۆ ئەوەی به راشكاوانه تر له بارەی پرس و كێشەكانییەوه قسه بكرێ. هەڵبەته له سێبەری شەڕ و دەسەڵاتی رەهای جەنەراڵ و ناسیۆنالیسته توندرەوەكاندا توركیا زۆر دوور بوو لەو بارەی كه عەزیز نەسین و بێشكچی و گەلێ نووسەر و بیرمەند و رۆشنبیری تری توركیا خەونیان پێوە دەبینی .

له ته‌ك ئه‌م بۆچوونه دروستانه‌دا عه‌زیز نه‌سین هه‌ندێ پرسی تر ده‌وروژێنێ كه له گه‌ڵ راستییه مێژووییه‌كاندا زۆر یه‌ك ناگرنه‌وه، وه‌كو به‌راوردكردنی باری توركه‌كانی بولگارستان له گه‌ڵ بارو دۆخی كوردی توركیادا. له باره‌ی ژماره‌ی توركمانه‌كانی عیراقیشه‌وه وادیاره كه‌وتۆته ژێر كاریگه‌ی رۆژنامه و گۆڤاره‌كانی وڵاته‌كه‌یه‌وه. گرنگه ئه‌م به‌رهه‌مه‌ی عه‌زیز نه‌سین له چوارچێوه‌ی كات و شوێنی خوێدا بخوێنرێته‌وه.

وه‌رگێرانی ئه‌م كتێبه له لایه‌ن هێژایان به‌كر شوانی و سیروان ره‌حیمه‌وه كارێكی زۆر به‌جێیه بۆ ئه‌وه‌ی خوێنه‌ری كورد ئاگاداری ئه‌و نووسین و به‌رهه‌مانه بێ كه له باره‌ی گه‌له‌كه‌یه‌وه نووسراون. به ئه‌مانه‌ته‌وه ده‌قه‌كه‌یان كردووه به كوردییه‌كی ره‌وان وئاست به‌رز. بۆ منیش مایه‌ی خۆشحاڵی بوو كه پێیدا بچمه‌وه وپێشه‌كی بۆ بنووسم .

# پێشەکی

## دەرفەتێك بۆ بەراورد

لە كۆتایی سالآنی هەشتای سەدەی بیست و دروست لە سالی 1989 دا بەڕێزان د. كەمالْ مەزهەر ئەحمەد و محەمەدی مەلا كەریم گفتوگۆیەكی درێژیان سەبارەت بە نووسەری ناسراوی تورك عەزیز نەسین و دۆستایەتیی وی بۆ كورد و بەراوردكردنی بە دۆستایەتیی نازم حیكمەت بۆ كورد لە سەر لاپەڕەكانی رۆژنامەی هاوكاری كرد. بێگومان پاش گفتوگۆی ئەو بەڕێزانە رەوشی وڵات سەرلەبەری بە هۆی داگیركردنی كوێتەوە گۆڕدرا. بۆ ئێمەی كوردیش پاشان شەڕی ئازادكردنی كوێت و راپەڕینی بەسەردا هات و سەرەتای قۆناغێكی دیكە و دەروازەی دنیای دیكەمان لەسەر كرایەوە، بۆیە بابەت و وتووێژی ئەو بەڕێزانە بە یەكجاری لە رۆژەڤدا نەما.

ئێمە لەبەر گرنگیی ئەو بابەتە و لە سۆنگەی گرنگیی ئەوەی كە بۆچوونی یار و نەیارەكان سەبارەت بە كێشەی كورد بزانین، بەشێكی گرنگ لەو كتێبەی عەزیز نەسین دەخەینە بەردەستی خوێنەری كورد، با پاش زۆرتر لە بیست سالیش بێت، بۆ ئەوەی خوێنەر بتوانێت خۆی بەراورد لە نێوان بۆچوونەكانی عەزیز نەسین و وتار و راكانی د. كەمال مەزهەر ئەحمەد و كاكە حەمەی مەلا كەریمدا بكات.

ناوی كتێبەكەی عەزیز نەسین بە توركی بەم جۆرەیە: "بولگارستاندە تویركلەر، تویركیەدە كویرتلەر". ئەگەر دەقاودەق بیكەین بە كوردی، دەبێت بە "توركەكان لە بولگارستان، كوردەكان لە توركیا." لە زمانی توركیدا بە كۆ ئاماژە بۆ ناوی گەل و نەتەوەكان دەكرێت، بۆیە نووسەر "توركەكان... كوردەكان"ی بەكار هێناوە. بەڵام لەبەر ئەوەی لە زمانی كوردیدا هەندێك جار وشەی تاكیش واتای كۆ دەگەیەنێت، ئێمە ناوی كتێبەكەمان بە كوردی كرد بە "تورك لە بولگارستان، كورد لە توركیا". وەك لە لاپەڕەی دووەمی چاپی دەیەمی كتێبەكەدا ئاماژەی پێ كراوە، كتێبەكە یەكەم جار لە سالی 1989دا چاپ كراوە، بەڵام نە نووسراوە لە چ دەزگایەكی بلاوكردنەوە. دواتر لە 1989-2000 بەدوای یەكدا 8 جار چاپ كراوەتەوە و سەرجەم 41 هەزار دانەی لێ چاپ كراوە. لە دەزگای بلاوكردنەوەی نەسین-یش جارێكی دیكە لە مانگی دووی سالی 2008دا چاپ كراوەتەوە. ئەو جارە 1000 دانەی لێ چاپكراوە و ئەمەش دەكاتە چاپی نۆیەم. لە مانگی چواری هەمان سالدا دەزگای بلاوكردنەوەی نەسین جارێكی تر 1000 دانەی لە كتێبەكە چاپ كردووە و ئەویش بووە بە چاپی دەیەم. بەو جۆرە، لە یەكەم چاپەوە بۆ دەیەم چاپ سەرجەم 43 هەزار دانە لە كتێبی "بولگارستاندە تویركلەر، تویركیەدە كویرتلەر" چاپ كراوە. چاپی دەیەمی كتێبەكە 232 لاپەڕەی قەوارە (19.5 x 13)سەنتیمەترە، بەڵام تەنیا ل1- ل97 سەبارەت بە كێشەی تورك لە بولگارستان و كێشەی كورد لە توركیایە و ئێمەش هەر ئەو بەشەمان وەرگێڕاوە. بەشەكانی دیكەی كتێبەكە سەبارەت بە بابەتی ترن و بۆ ئێمە سەرنجڕاكێش نین. لەگەڵ ئەم وەرگێڕانەدا چاپی دەیەمی كتێبە توركییەكەشمان خستووەتە بەردەستی ئەكادیمیای كوردی.

ئەو بەشەی كە ئێمە وەرمانگێڕاوە، كۆمەڵێك نامەی وەزارەتەكان و بڕیاری هەندێك لە دادگاكانی توركیا و بەرگرینامەی تۆمەتباركراوان و پارێزەران لە خۆ دەگرێت. بەڵام هەموو ئەو بەڵگەنامانە وەك تێكست لە كتێبەكەدا دانراون و وێنەی بەڵگەنامەكانیان لەگەڵدا نییە. ئاشكرایە بەڵگەنامەكان دەبێت ئێستا لە وەقفی

**عەزیز نەسین لە ئیستانبوڵ پارێزرابن. بەشی زۆری نامەی وەزارەتەکان و بڕیارنامەی دادگاکان و بەرگرینامەکانی تۆمەتبارکراوان و پارێزەرانمان کردووە بە کوردی، تەنیا ئەو بەشە کەمە نەبێت کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە عەزیز نەسینەوە نییە.**

**لەگەڵ ئەم وەرگێڕانەدا، بە مەبەستی بیرهێنانەوە، یان بەراورد بۆ کەسانێك خوازیاری بن، وتارەکانی د. کەمال مەزهەر ئەحمەد و کاکە حەمەی مەلاکەریم بڵاو دەکەینەوە. دەقی وتارەکانی ئەو دوو بەڕێزەمان لە ڕۆژنامەی "هاوکاری" وەرگرتووە و بێ دەستکاریکردنی ڕێنووس وەك خۆی خستوومانەتە دووتوێی ئەم کتێبەوە. لە سەرەتای هەر وتارێکیشدا ئاماژەمان بۆ سەرچاوەکەی کردووە.**

**ئێمە ئەم کتێبەمان بۆ دوو مەبەست ئامادە کردووە:**

**یەك: زۆر پێویستە بزانین چیمان لەسەر گوتراوە و نووسراوە.**

**دوو: دەرفەتێکە بۆ بەراورد لە نێوان ئەو نووسین و لێدوانانە و بۆچوون و هەڵسەنگاندنەکانی خۆماندا.**

**بەکر شوانی** **سیروان رەحیم**

**هاوینی** 2010

# تورك له‌ بولگارستان:

## نامه‌ی سه‌ندیكای نووسه‌رانی توركیا بۆ یه‌كیه‌تیی نووسه‌رانی بولگارستان

**ئه‌نجوومه‌نی سه‌رۆكایه‌تیی یه‌كیه‌تیی نووسه‌رانی بولگارستان، سۆفیا**

سه‌رۆكی به‌ڕێز و هاوپیشه‌ هێژا و به‌نرخه‌كانی ترمان،

له‌به‌ر ئه‌وه‌ی پاش كوده‌تای سه‌ربازیی 1980/9/12 له‌ توركیا كاره‌كانی سه‌ندیكای نووسه‌رانی توركیا قه‌ده‌خه‌ كران، درانه‌ دادگه‌ و پاش پێنج ساڵ له‌ دادگاییكردنمان سه‌ندیكاكه‌مان تازه‌ توانیویه‌تی ده‌ست به‌ چالاكی بكاته‌وه‌، ئه‌م نامه‌یه‌ كه‌ پێویست بوو ماوه‌یه‌كی زۆر له‌مه‌وبه‌ر بۆ ئێوه‌مان بنووسیبا، دواكه‌وت و وا ئێستا بوارمان هه‌یه‌ و ده‌توانین بۆتانی بنووسین.

له‌ ساڵی 1960-وه‌ تا ئێستا وه‌ك نووسه‌رانی تورك و نووسه‌رانی بولگاری، په‌یوه‌ندیی دۆستانه‌ و برایه‌تی و هاوپیشه‌ییمان بنیات ناوه‌، ئه‌و په‌یوه‌ندییه‌مان پێشخستووه‌ و هه‌میشه‌ له‌ سه‌رووی په‌یوه‌ندیی نێوان حكوومه‌ته‌كانمانه‌وه‌ بووه‌. هه‌روه‌ها پێمان وا بووه‌ په‌یوه‌ندییه‌كانمان فره‌ دڵسۆزانه‌ و پته‌ون. وه‌ك سه‌ندیكای نووسه‌رانی توركیا و یه‌كیه‌تیی نووسه‌رانی بولگارستان له‌ هه‌ماهه‌نگیی و هاوكارییه‌كی نموونه‌ییدا كاری هاوبه‌شمان كردووه‌. به‌تایبه‌تیش ئه‌و مافی هاووڵاتیبوونه‌ی درابوو به‌ توركه‌كانی بولگارستان و له‌گه‌ڵ مافی هاووڵاتیبوونی بولگاره‌كاندا یه‌كسان بوو، ئێمه‌ وه‌ك یه‌كێك له‌ سه‌ركه‌وتنه‌كانی ده‌سه‌ڵاتی سۆسیالیزم چاومان لێ ده‌كرد و ئه‌و بوویه‌ره‌ جوانه‌مان به‌و شێوه‌یه‌ پێشانی خوێنه‌رانی خۆمان ده‌دا.

له‌ سۆفیا وه‌شانخانه‌یه‌كی گه‌وره‌ هه‌بوو هه‌مان كات به‌رهه‌می توركی و به‌رهه‌می بۆ توركی وه‌رگێڕدراوی بڵاو ده‌كرده‌وه‌. زۆربه‌ی ئه‌و كتێبه‌ به‌نرخانه‌ی كه‌ نه‌ده‌توانرا له‌ توركیا چاپ و بڵاو بكرێنه‌وه‌ بێ ئه‌وه‌ی قه‌ده‌خه‌ش بن، ئێمه‌ له‌و وه‌شانخانه‌یه‌ به‌ ده‌ستمان ده‌خستن. بۆ نموونه‌، كۆی به‌رهه‌مه‌كانی نازم حیكمه‌ت كه‌ هه‌شت به‌رگ بوون، له‌و وه‌شانخانه‌یه‌ كڕیمان. قوتابخانه‌ هه‌بوون له‌ پاڵ زمانی بولگاریدا وه‌ك ڕێوشوێنێكی سرووشتی په‌روه‌رده‌ی توركییان بۆ توركه‌كاتی بولگارستان دابین ده‌كرد و په‌یمانگای پێگه‌یاندنی مامۆستایانی تورك هه‌بوو. ڕۆژنامه‌ی توركیی هه‌فتانه‌ و گۆڤاری منداڵان و ماگه‌زینی مانگانه‌ بڵاو ده‌كرانه‌وه‌. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی یه‌ك له‌ ده‌ی دانیشتووانی بولگارستان توركن، توركه‌كانی بولگارستان ده‌یانتوانی به‌شێوه‌یه‌كی یه‌كسان سوود له‌ هه‌مان مافه‌كانی هاووڵاتیانی بولگارستانی وه‌ربگرن، بۆیان هه‌بوو له‌ دامه‌زراوه‌ و ڕێكخراوه‌كاندا ببن به‌ ئه‌ندام و كار بدۆزنه‌وه‌ و ئه‌رك له‌ ئه‌ستۆ بگرن. له‌ لێكدانه‌وه‌كانی ئه‌و ڕۆژگارانه‌ماندا ئاماژه‌مان ده‌كرد بۆ ئه‌وه‌ی هیچ توركێكی بولگاری هه‌ستی نه‌ته‌وایه‌تیی توركیی خۆی ناشارێته‌وه‌ و خۆی به‌ هاووڵاتیی به‌ره‌چه‌ڵه‌ك توركی بولگارستان ده‌زانێت، ئێمه‌ش ئه‌مه‌مان وه‌ك یه‌كێك له‌ سه‌ركه‌وتنه‌كانی سۆسیالیزم ده‌بینی و له‌ ڕێی نووسین و كتێبه‌كانمانه‌وه‌ ئه‌م تێبینییه‌ جوانه‌مان ده‌گه‌یانده‌ خوێنه‌رانی تورك. بۆ نموونه‌، سه‌رۆكی گشتیی سه‌ندیكای نووسه‌رانی توركیا عه‌زیز نه‌سین ساڵی 1965 له‌ كاتی سه‌ردانیدا بۆ بولگارستان له‌ باره‌گای سه‌رۆكی بولگارستان (سكرتێری گشتیی پارتی كۆمۆنیستی بولگارستان) تۆدۆر ژیڤكۆڤ چاوی به‌ سه‌رۆك كه‌وت و لێدوانه‌ فه‌رمییه‌كه‌ی سه‌رۆك ڕۆژی 1965/11/15 له‌ ڕۆژنامه‌ی "ئاكشام"ی توركیدا بڵاو كرایه‌وه‌ و ئه‌و بڵاوكردنه‌وه‌یه‌ مایه‌ی

ڕەزامەندی و خۆشحاڵیی ژیڤکۆڤ بوو. ئەو گفتوگۆیە لە کتێبی "لێپرسینەوە"ی عەزیز نەسیندا بڵاو کراوەتەوە جێی گرتووە و ئێمە لێرەدا پوختەیەکی دەخەینە ڕوو:

عەزیز نەسین:

- وەك دەنزاندرێت ژمارەی کەمینەی تورك لە بولگارستان نێزیکەی یەك لە دەی ژمارەی دانیشتووانە. بینیمان لێرە کەمینەی تورك لە هەلومەرجێکی یەکساندا دەژی. پەروەردە و پێگەیاندنی تورکەکانی بولگارستان بە چ ڕێگەیەك دەبێت؟ ڕێژەی بەشداربوونی تورکەکانی ئێرە لە لە دامودەزگا میللییەکانی بولگارستان و لە ڕێکخراوەکاندا چەندە؟

تۆدۆر ژیڤکۆڤ:

- حکوومەتی کۆماری میللیی بولگارستان کە لەسەر بنەمای سیاسەتی مافی یەکسانیی سەرجەم گرووپە میللییەکانی دانیشتووی وڵاتمان کار دەکات، لە ماوەی بەڕێوەبەرایەتیی جەماوەریی 21 ساڵی ڕابردوودا هەنگاوی زۆری ناوە بۆ گەشەپێدانی کولتووریی ماکی و میناکی (مادی و مەعنەویی) هاووڵاتیانی تورك. ئەو تورکانەی ئێستا لە بولگارستان دەژین، وەك هاووڵاتیانی وڵاتی ئێمە خاوەن هەموو مافێکن و شان بەشانی ڕەنجدەرانی بولگار کۆمەڵێکی نوێ دادەمەزرێنن. ئەوان چ لە ژیانی سیاسی و چ لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا بەشێوەیەکی چالاك بەشدارن. بۆ نموونە، لە ئەنجوومەنی میللەتی بولگارستاندا 10 پەرلەمانتاری تورك هەن. زیاد لە 4 هەزار ئەندامی تورك لە ئۆرگانە خۆجێییەکانی بەڕێوەبەرایەتیی جەماوەریدا، واتا لە شووراکانی شارەوانیی پارێزگا و شار و ناوچەکاندا کار دەکەن. 900 کەس لەوانە ژنن. نێزیکەی 90٪ی دەنگدەرانی تورك ئەندامی ڕێکخستنەکانی بەرەی نیشتمانین. (...) بۆ نموونە، لە بولگارستانی بۆرجوازیی پێشوودا لە 356 قوتابخانەی سەرەتاییدا تەنیا 35 هەزار قوتابیی تورك خرابوونە بەر خوێندن و لە وڵاتی ئێمەدا تەنیا 167 ئامادەییی تورکی و قوتابخانەی پەروەردە و پێگەیاندنی ئاینی هەبوون، بەڵام ئەمڕۆ زیاد لە 158 هەزار قوتابیی تورك لە 1556 قوتابخانەی سەرەتایی، ناوەندی، ئامادەیی و پیشەییدا دەخوێنن. لە سەردەمی دەسەڵاتی جەماوەریماندا 14 هەزار کچ و کوڕی تورك قۆناغی حوێندنی ئامادەیی و خوێندنی بەرزیان تەواو کردووە. ئێستا هەموو ساڵێك نێزیکەی 12 هەزار کچ و کوڕی گەنجی تورك لە ئامادەییەکان دەخوێنن. (...) ئەمانە دەبن بە خاوەنی بڕوانامەی بڵند و وەك پزیشك، ئەندازیاری کشتوکاڵ، ئەندازیار، ڕۆژنامەنووس، نووسەر، دەرهێنەر و موزیکڤان کار دەکەن. لەو شوێنانەی بەچڕی هاووڵاتیانی تورکیان لێ دەژین، زیاد لە 600 قوتابخانە بنیات نراون. لە سەرجەم گوندەکان "ماڵی گەل" و "مەڵبەندی خوێندنەوە" کراونەتەوە و کتێبی تورکی و کتێبی ئەدەبیی پێویستیان تێدا هەیە. تا ئێستا 700 کتێبی تورکی بە تیراژی 3 ملیۆن و نیو چاپ کراون. بەڕێوەبەرایەتیی جەماوەریمان ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی وەك "یەنی ئیشك– تیشکی نوێ، خەڵك گەنجلیغی – لاوێتیی گەل، یەنی حەیات – ژیانی نوێ" بۆ تورکەکان دەردەکات. تیراژی ئەمانە 90 هەزارە.

★★★

وا لێرەدا بەشێکی کورتمان لە قسەکانی بەڕێز تۆدۆر ژیڤکۆڤ خستە ڕوو و ئێمەش بەچاوی خۆمان بینیمان کە قسەکانی ڕاستن.

چەند بەشێك لە نووسینەکانی عەزیز نەسین سەبارەت بە تورکەکانی بولگارستان کە لە تورکیا بڵاو بوونەوە، لە بولگارستان وێنەیان لەبەر گیراوەتەوە، بە ژمارەیەکی زۆر و بە باڵەفڕ لەو هەرێمانە فڕێ دراونەتە خوارەوە کە بەچڕی تورکیان تێدا دەژین، لەو ڕێیەوە داوا لە تورکەکان کراوە لە بولگارستان بمێننەوە و کۆچ نەکەن بۆ تورکیا. چەندین نووسەری ئەندام لە سەندیکای نووسەرانمان زنجیرەیەك وتار و کتێبیان بڵاو کردەوە و لە نووسیەنەکانیاندا ئەم هەڵوێستە نوێ و مرۆڤدۆستانەیەی کۆماری میللیی بولگارستانیان بەرز نرخاند.

لە کاتێکدا ڕەوش بەو جۆرە دەچووە پێشەوە، لە سەرووی هەموویانەوە تۆدۆر ژیڤکۆڤ و حکوومەتی بولگارستان و سەرجەم بەڕێوەبەران و لێپرسراوانی بولگارستان هێدی هێدی دەستیان کرد بە گۆڕینی ئەو سیاسەتە ئەرێنییە و لە ماوەی 15 ساڵی ڕابردوودا ئەو سیاسەتە بەتەواوی پێچەوانە کرایەوە و بەهەموو شێوازەکانی پاڵەپەستۆ و گوشار بەکارهێنان هەوڵ دراوە و دەدرێت تورکەکانی بولگارستان لە ناو خۆیاندا بتوێننەوە. سەرەتا قوتابخانە تورکییەکان و مەڵبەندەکانی خوێندنەوەی شوێنی کۆکردنەوەی کتێبی تورکی داخران. پاشان مامۆستایانی تورك لە کار دەرکران و وەشانخانە تورکییەکەی سۆفیا داخرا. بە بانگەشەیەکی نازانستیی وەك ئەوەی گوایە خەتەنەکردن پێچەوانەی بنەماکانی مارکسیزمە، هەوڵ درا خەتەنەکردنی منداڵانی تورك قەدەخە بکرێت (دواتر حکوومەت لە بەرامبەر خۆڕاگریی خەڵکدا لەم هەڵوێستە پاشگەز بووەوە)، دواتر لە قوتابخانەکان وانەی تورکی قەدەخە کرا و بڵاوکردنەوەی گۆڤار و ڕۆژنامە تورکییەکان ڕاگیرا.

ئێمە وەك نووسەرانی تورك کە بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانس و کۆبوونەوە نێودەوڵەتییەکان، یان بە بانگهێشتی تایبەت و بە سەردان چووینەتە بولگارستان، ڕاشکاوانە بە حکوومەتی بولگارستان و لێپرسراوانمان گوتووە ئەو پاشەکشەیە هەڵەیە و لەو ڕووەوە ڕەخنەمان لێیان گرتووە. بەڵام بەئومێدی ئەوەی لێپرسراوانی بولگارستان هەست بەو هەڵەیە بکەن و هەوڵی ڕاستکردنەوەی بدەن، بە گونجاومان نەزانیوە لە تورکیا ڕەخنەکانمان بڵاو بکەینەوە، چونکە ویستومانە ڕێ لە دەوروبەرە توندڕۆ و دواکەوتووەکانی تورکیا بگرین بۆ ئەوەی پڕۆپاگەندەی پێوە نەکەن و پەیوەندیی دۆستانەی نێوان هەردوو وڵاتی هاوسێ تێك نەچێت.

هەرچەندە سەرۆکی سەندیکای نووسەرانی تورکیا، بەمەبەستی ئەوەی بە ڕاشکاوانە لەمەڕ ئەو بابەتە قسە بکرێت، چەندین جار داوای چاوپێکەوتنی لە بەڕێز تۆدۆر ژیڤکۆڤ کرد، بەڵام لە سۆنگەی درێژکردنەوەی بابەتەکە و وەڵامنەدانەوە بە پەسەند کردن یان ناپەسەندکردن، ئەو دیمانەیە سەری نەگرت.

گوشاری حکوومەتی بولگارستان بۆ سەر تورکەکانی ئەو وڵاتە لەبەرەوە پەرەی سەند تا لە ئاکامدا مێژووی فەرمیی بولگارستان هاتە گۆڕین و تێگەیەکی نوێی مێژووی سیاسی هێندرایە ئاراوە کە دەڵێت : تورکەکانی بولگارستان پێش هەزار و ئەوەندە ساڵ بەڕەچەڵەك سلاڤی بوون و دواتر بوون بە موسڵمان و خۆیان بە تورك زانیوە. ئەمە بەمەرجێك بەپێی مێژووی پێشتر دەگوترا بولگارەکان لە ڕەچەڵەکی بولکاری تورکن و دواتر لە ناو میللەتانی ئەو هەرێمەدا تواونەتەوە و بوون بە سلاڤی. ئێمە قسە لەسەر ڕاستی و چەوتی تێگە مێژووییەکان ناکەین، بەڵام ئەوەی بەتەواوی بەڕاستی دەزانین و باوەڕمان پێی هەیە ئەوەیە ناکرێت بە پشتبەستن بە مێژووی هەزار، یان دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر دەستکاری نیشتمان و کەسایەتیی مرۆڤ بکرێت و گۆڕانی بەسەردا بهێندرێت. مرۆگەل بەویستی خۆیان بڕیار دەدەن سەر بە چ گەلێکن، تەنانەت ئازادن لە هەڵبژاردنی نەتەوەی خۆیان و پێویستە ئازادیش بن. پاڵەپەستۆی سەر مرۆگەل لە ژێر گوشار و ستەمی دەوڵەتدا بەمەبەستی گۆڕینی

ناسنامە و کەسایەتیی مرۆڤ ڕەفتارێکی پێچەوانەی سۆسیالیزم، مرۆڤدۆستی، دیموکراسی، مافی مرۆڤ و تەنانەت مرۆڤایەتیشە.

حکوومەتی بولگارستان بە پشتبەستن بەو تێگە نوێیەی مێژوو، وەك چۆن هەموو ئەو مافانەی کە پێویستە بە گەلێك ڕەوا ببیندرێن، لە تورکەکانی بولگارستان سەندووەتەوە، بەهەمان شێوە و بە بەکارهێنانی هێز ناوی تورکەکانیشی کردووە بە بولگاری.

وەك ئەنجامی تێگەی مێژوویی دەستکرد و داسەپێنەری حکوومەتی بولگارستان ناوی تورکەکانی بولگارستان گۆڕدراوە بۆ ناوی بولگاری و ئەو تورکانەی ڕووبەڕووی ئەو کردارەش بوونەتەوە، دووچاری پاڵەپەستۆی زیاتر بوون.

ڕادەگەیەنین سەرجەم ئەو کردەوانە، جا لە هەر شوێن و کاتێك بێت، بەتەنیا بەواتای پێشێلکردنی بنەماکانی سۆسیالیزم نییە، بگرە دژبەر و پێچەوانەی دیموکراسی، مافەکانی مرۆڤ و سەردەمی نوێیە و سەرەتا ئەم ڕاگەیەندراوەمان دەگەیەنین بە نووسەرانی بولگارستان و بە هیواین هاوپیشە بولگارییەکان، ئەوانەی لایەنگری ڕاستین، پشتیوانیمان لێ بکەن.

ماوەیەکی درێژخایەنە ژمارەی هاووڵاتیانی بولگار زیاد ناکات و لە بەرامبەر ئەوەشدا ژمارەی هاووڵاتیانی تورکی بولگارستان بەردەوام ڕوو لە هەڵکشانە و ئەمەش لەو وڵاتە جۆرێك لە نیگەرانیی خوڵقاندووە. ڕێگەی هاوچەرخ و مرۆیی بۆ ڕزگاربوون لەو نیگەرانییە ئەوە نییە ئاین و زمان و ناو و کەلەپووری تورکەکانی بولگارستان لە ژێر پاڵەپەستۆی دەوڵەتدا بگۆڕدرێت، بگرە چارەسەر ئەوەیە تورکەکان بەگرتنەبەری ڕێبازەکانی پەروەردەی زانستی و هەڵوێستی مرۆییانە بکرێن بە هاووڵاتیی بولگارستان. وەك بەڕێز تۆدۆر ژیڤکۆڤیش لە لێدوانەکانی بیست ساڵ لەمەوبەریدا ئاماژەی پێ دابوو، سەردەمانێك ئەو ڕێبازە هاوچەرخ و مرۆییە پەیڕەو دەکرا.

ئێمە وەك نووسەرانی ئەندام لە سەندیکای نووسەرانی تورکیا، دژی ئەو تێگە مێژووییەین کە بۆ کورد داتاشراوە و لایەنگری جیاخوازیش نین و لە چوارچێوەی هەوڵماندا بۆ گۆڕینی ئەو یاسایانەی لە کۆماری تورکیا کاریان پێ دەکرێت و ئازادیمان سنوودار دەکەن، هەمیشە ناڕەزاییمان پێشان داوە و بەردەوامیش دەبین لە ناڕەزایی پێشاندان.

ئەوەی لە پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتە دواکەوتووەی بولگارستاندا هەرە زیاد ئێمە نیگەران دەکات، ئەوەیە هیچ ڕۆشنبیرێکی بولگار ناڕەزایی پێشان نەداوە و ناڕەزایی هەبووبێتیش، لەلایەن ئێمە و جیهانەوە نەبیستراوە. لە هەمووشی سەرسوڕهێنەرتر و خەمگینتر ئەوەیە ئەندامانی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان کە پێویستە پێشەنگی ڕۆشنبیران بن، لەم ڕووەوە هیچ ناڕازیبوونێکیان لێ بەدی نەکراوە.

چەندین دۆست و برادەری نووسەری بولگارستانیمان هەن باوەڕمان وایە لایەنگری ڕاستین و پێکەوە خەباتمان کردووە بۆ ئاشتیی جیهانی و دۆستایەتیی گەلان و ئێمە بەڕاستی ئەوانمان خۆش ویستوە. ئایا بێدەنگبوونی سەرجەم نووسەرانی بولگارستان لە ئاست ئەم بابەتە پێشاندەری ئەوەیە کە ڕەفتارە ئەنجامدراوەکانی پشتبەستوو بەو تێگە مێژووییە دەستکردە بەڕاست دەزانن و پشتیوانی لێ دەکەن، یاخۆ بەهۆی پاڵەپەستۆی قورسەوە دەنگیان لێوە نایەت؟ زۆر حەز دەکەین ئەمە بزانین. ئێمە، سەندیکای نووسەرانی تورکیا، ناتوانین ئەگەری دووەم پەسەند بکەین، چونکە ئێمە لە تورکیا لە ژێر گوشاری تەنانەت زۆر لەوەی ئەواندا زیاتر هەموو مەترسییەکمان لەبەر چاو گرتووە و سنگی خۆمان داوەتە بەری و ڕەخنەی خۆمان ڕاگەیاندووە و ڕای

دەگەیەنین. بەم جۆرە و بێ ئەوەی بانگەشەی پاڵەوانێتی بکەین، بەو ڕێیەدا ڕۆیشتین کە پێویستە هەموو نووسەرانی جیهان پیایدا بڕۆن.
بەئومێدی وەرگرتنەوەی وەڵام، ئەم نامەیە بە پۆستی تۆمارکراو دەنێرین بۆ یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان، باڵوێزخانەی بولگارستان لە تورکیا و کۆنسوڵخانەی بولگارستان لە ئیستانبوڵ.
سەردەم و قۆناغی مێژوویی وا هەبووە تاکە کەسێکی سەرڕاست و بەجەرگ توانیویەتی بەتەنیا شکۆی گەلی خۆی ڕزگار بکات. تەنانەت یەك نووسەری بولگاری ئەگەر بتوانێت بەرگری لە ڕاستی و ڕاستگۆیی بکات، دەتوانێت مەشخەڵێك دابگیرسێنێت و تاریکیی ئەو گوشارەی کە بە هەموو بولگارستاندا بڵاو دەبێتەوە، ڕووناك بکاتەوە و ڕاستی پێشان بدات. چاوەڕێی ئەو ژیری و بەجەرگییە لە نووسەرانی هاوپیشەی بولگاریمان دەکەین.
وەك نووسەران، پەیوەندیی نێوان گەلەکانمان لە پەیوەندیی فەرمیی نێوان حکوومەتەکانمان بۆ ئێمە زیاتر مایەی بایەخ پێدانە. ئەمڕۆ تەنانەت لەگەڵ بەردەوامبوونی هەلومەرجە خراپەکانیشدا حکوومەتەکانی تورکیا و بولگارستان دەتوانن بەبۆنەی هەبوونی هەندێك بەرژەوەندیی بەرانبەر پەیوەندییەکی روکەشیان هەبێت، بەڵام ئێمەی نووسەرانی تورك باوەڕمان وایە بێدەنگبوون و چاونوقاندن لە ئاست ئەو ڕەفتارە نامرۆییانەی ئەمڕۆ لە بولگارستان ئەنجام دەدرێن، لە داهاتوودا زیان بە پەیوەندیی نێوان گەلەکانمان دەگەیەنێت. ئاشکرایە ئێمەی نووسەران مرۆگەلی بنیاتنەری دوارۆژین و دەمانەوێت پردی دۆستایەتی و خۆشەویستییەکی ڕاستەقینە و ژدل و بەتین لە نێوان گەلەکانماندا بنیات بنێین.
لەبەر ئەوەی نامانەوێت ببێت بە سەرچاوە بۆ دەوروبەرە داخراو و پاشقەڕۆکان و ناخوزازین هەرا بنێتەوە، ئەم نامەیە نادەین بە چاپەمەنی. دامەزراوە فەرمییەکانی دەوڵەت و ڕای گشتیی تورکیا و نێودەوڵەتیشی لێ ئاگادار ناکەینەوە. دەمانەوێت ئەم نامەیە وەك کێشەیەك بمێنێتەوە کە لە ئەنجوومەنی دەستەی بەڕێوەبردنی سەندیکای نووسەرانی تورکیا گفتوگۆی لەسەر کراوە. سێ مانگ لە دوای ناردنیشی بە پۆستی تۆمارکراو بۆ ئەو سێ شوێنەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێیان داوە، بەئومێد و گەشبینییەوە چاوەڕێی نامەی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان دەکەین. بەهیواین نامەکە لە سکرتارییەتی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان ڕانەگیرێت و بگەیەندرێت بەسەرجەم نووسەرانی بولگارستان. ئەگەر لە ماوەی سێ مانگدا وەڵامی نامەکەمان وەرنەگرینەوە، یان وەڵامێك وەربگرینەوە هەوڵ بدات گوشاری سەر تورکەکانی بولگارستان وەك کارێکی ڕاست و ڕەوا پێشان بدات، ئەوا ناچار دەبین لە تورکیا کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی ببەستین و ناوەڕۆکی ئەم نامەیە و ئەو وەڵامەی وەری دەگرینەوە، یان وەرنەگرتنەوەی وەڵام بەڕای گشتیی تورکیا و جیهان بگەیەنین و تەواوی ئەم بەڵگەنامانە بۆ سەرجەم ڕێکخراو، یەکیەتی و سەندیکاکانی نووسەرانی جیهان، یانەی قەڵەم (PEN) و سەرجەم ڕێکخراوە دیموکراتییەکان بنێرین و داوای پشتیوانی و پشتگرتنیان لێ بکەین. بەداخەوە ڕەوشەکە ڕادەگەیەنین.
ئێمەی نووسەرانی تورك، ئەو دۆستایەتییە جوان و لە بیرنەکراوەی کە سەردەمانێك لەگەڵ نووسەرانی بولگاریدا هەمانبوو، ئاواتمانە سەرلەنوێ دای بمەزرێنینەوە و بیژێنینەوە.
هەمیشە بۆ ئاشتی و هەردەم بە هەستی دۆستانە و ڕاستەقینەی هەڵقوڵاو لە ناخەوە.

بە کۆی دەنگ و ڕەزامەندیی ئەندامانی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی سەندیکای نووسەرانی تورکیا،
سەرۆکی گشتیی سەندیکای نووسەرانی تورکیا
عەزیز نەسین

## وەڵامی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان بۆ نامەکەی سەندیکای نووسەرانی تورکیا

بۆ ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی سەندیکای نووسەرانی تورکیا

سەرۆکی بەڕێز،

هاوپیشە بەڕێزەکان...

لە ڕێی نامەکەتانەوە کە زۆر درەنگ گەیشتە سۆفیا، زانیمان سەندیکاکەتان پاش تەنگژەیەکی درێژ، سەرلەنوێ دەستی بە چالاکییە ئاساییەکانی خۆی کردووەتەوە.

ئەمە بەڕاستی ئێمە لە ناخەوە خۆشحاڵ دەکات، چونکە ئێمەش پەیوەندیی دۆستانە و بنیاتنەرانەی ساڵانی ڕابردووی ڕێکخراوەکانی هەردوولامان لە بیرە کە ئێوەش ئاماژەتان پێ داوە. ئەگەر شادبوونەکەمان لە کاتی خۆیدا بێت، ئێمە لەگەڵ هیوا خواستن بۆ زیاتر پێشکەوتنی پەیوەندیی باش و بنیاتنەرانەمان، دەمانەوێت پێتان ڕابگەیەنین ئامادەین بۆ هەموو جۆرە هەماهەنگی و پێکەوە کارکردنێك لەگەڵ ئێوەدا.

کاتێك لە ڕۆژنامەکاندا خوێندمەوە هەندێك نووسەری ناوداری تورك لەبەر ئەوەی بۆ ئاشتی تێکۆشاون، یان بەهۆی بەشداریکردنیان لە کۆبوونەوەکانی نووسەران لە سۆفیا، لە تورکیا دراونەتە دادگە، لە کاتی سەردانی سەرکۆماری تورکیا کەنان ئەڤرەن بۆ بولگارستان نامەیەکم بەناوی خۆم و یەکیەتییەکەمانەوە بۆی نووسی. ئەوسا دۆستی دێرینم عەزیز نەسین منی قایل کرد بەوەی ئەو جۆرە نامە نووسینانە سوودیان نییە و تەنیا زیانتان پێ دەگەیەنێت. بەڵام لە ساتە دژوارەکاندا هەمیشە لە پشتتان بووین.

پێویستە ددان بنێم بەوەدا کە بەهیوا بووم کۆبوونەوەی دیپلۆماتکارانی بالکان لە بەلگراد کەشێکی ئەرێنی دەخولقێنێت بۆ پێشخستن و نوێکردنەوەی پەیوەندیی خۆشی ڕابردوومان. ئەم قسانەم وەك ڕوونکردنەوەیەکی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان لێ وەربگرن.

هاوپیشە بەڕێزەکان، بەداخەوە پێویستە بڵێم لە نامەکەتاندا پڕوپاگەندە خراپەکانی ساڵانی ناجۆری ڕابردوو دەهێننە زمان. دەخوازم بەر لە هەموو شتێك بڵێم بەهیچ جۆرێك گومانمان لە نیازپاکی، توانای نووسین و نیشتمانپەروەریتان نییە. تەواو بە پێچەوانەوە، ڕێزی لێ دەگرین. بەڵام تکاتان لێ دەکەین مۆڵەتمان پێ بدەن پێتان بڵێین ئێمەش خاوەنی هەمان ئەو هەستانەین. بنەمای سەرەکیی پڕوپاگەندەی ئیمپریالیزم بریتی بووە لە "دابەش بکە و دەستی بەسەردا بگرە". بۆ ئەوەش پەیتاپەیتا پەنای بردووە بۆ بەکارهێنانی نەتەوەپەرستی و شۆفینزم و بۆ ئەو مەبەستە کەڵکی لە ئەدەبیاتیش وەرگرتووە. بالکان سەمبولی ئەو جۆرە ناکۆکییە دەستکردانەیە. نامەوێت برینی کۆن بکولێنمەوە و ناچمە ناو وردەکارییەکانەوە. ئێمەش ئاگامان لەو کێشانەی لای ئێوە هەیە کە سەرچاوەی ئاڵۆزین، وەك "تراجیدیای قوبرس، پرسی کورد و قڕکردنی (جینۆساید)ی ئەرمەنییەکان". لەگەڵ ئێوەدا لەسەر ئەم بابەتانە گفتوگۆی بوێرانەمان کردووە.

مەگەر تاوانی کێشەی کەمینەی تورك لە بولگارستان بەڵگەی ئەم قسەیەمان نییە؟

وەك ئەوەی لە هەموو وڵاتێکی مەدەنی و دیموکراتدا هەیە، هاووڵاتیانی کۆماری میللیی بولگارستانیش، ئاینیان هەرچییەك بێت، هەموویان خاوەنی مافی یەکسانن. لە خۆیان بترازێت، کەسی تر مافی ئەوەی نییە ئەوان بخاتە سەر کۆمەڵی تر، یان بیانخاتە چوارچێوەی سنوورگەلی ترەوە.

دەوڵەتی ئەمڕۆی تورك بە كردەوە داكۆكی لەو تێگەیە دەكات كە ئاینی ئیسلام ئاینی نەتەوەی توركە. سەرەتای ئەم مەزەندەكردنی ئایینە (سكێپولاسیۆن) درێژ دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئەوە پاشڤەڕۆیەتییە و لەگەڵ پەیوەندیی ئەرێنیی نێودەوڵەتیدا ناگونجێت. بەم واتایە، هەوڵی توركیا بۆ داكۆكیكردن لە موسڵمانەكانی بولگارستان پێچەوانەی یاساكانە و دووربینانە نییە و پەلامارێكی زەقە بۆ سەر مافەكانی مرۆڤ.

با باسی ئەوە هەر نەكەین كە دەوڵەتانی مەدەنی بە پێچەوانەی ناوەڕۆكی بنەماكانی هەلسەنكی و شێوازی نوێی بیركردنەوەی جیهان هەڕەشەی "بە قوبرسكردن" لە بولگارستان دەكەن. ئێمە بەگەرمی پشتیوانی لە سیاسەتی یەكیەتیی كۆمارە سۆسیالیستەكانی سۆڤیەت و گۆرباتچۆف دەكەین.

گەلی بولگار نەهاتووە لە پێناوی پەیوەندیی هاوسێیانەی باش و ئاشتی و داهاتوودا پەردە لەسەر ڕاستییە رەش و تاریكەكانی مێژوو هەڵبداتەوە. بەڵام چ مێژوو و چ مرۆڤایەتی ئەو ڕاستییانەیان لە بیر نەكردووە. هاووڵاتیانی بولگارستان بە چاوپۆشی لە جیاوازیی ئاین پێكەوە دەژین و لە نێوان موسڵمانانندا كەسانی وا هەن هەردوو زمانی بولگاری و توركی بەكار دەهێنن. ئەمەش لەو مافانەیە كە حكوومەتی سۆسیالیزم بۆیانی دەستەبەر كردووە.

گواستنەوەی ئەو كێشە بێ بناغەیە بۆ سەكۆ نێودەوڵەتییەكان، وەك ئەوەی لە نامەكەتاندا نووسیوتانە، هەل بۆ ئێمەش دەڕەخسێنێت بەدەر لە ویستی خۆمان لەبەر چاوی هەموو جیهان باس لە مێژووی بولگارستان و مافەكانی گەلی بولگار بكەین. كاتێك بەدواچوون بۆ چاپەمەنیی جیهان دەكەین، تێبینیی ئەوە دەكەین هاووڵاتیانی بولگار لە چاو هاووڵاتیانی تورك خاوەن مافی دیموكراتیی زیاترن و خۆشگوزەرانتر دەژین.

لە بولگارستان چەندین مزگەوت پارێزراون و نۆژەن كراونەتەوە. لە زانكۆی سۆفیا بەشی زمانی توركی هەیە. هاوپیشە بەڕێزەكانمان، بەرهەمەكانی ئێوەش وەردەگێڕدرێنە سەر زمانی ئێمە، چاپ دەكرێن و دەفرۆشرێن. ئێمە نووسەری وامان هەیە توركی دەخوێنێتەوە و دەنووسێت و ئەوانە لە نووسەرانی سەركەوتووی ئێمەن. پێمان وایە لەو ساڵانەدا كە چالاكییەكانی سەندیكای نووسەرانی توركیایان تێدا ڕاگیرابوو، پڕوپاگەندەی ڕانەوەستاوی دژە بولگاری ئیمپریالیستەكان بەشێوەیەكی نەرێنی كاری لە ئێوەش كردووە.

ماوەیەك لەمەوبەر لە مۆسكۆ گەیشتم بەو ئاستی خۆشحاڵییە گفتوگۆیەكی درێژ لەگەڵ نووسەری ناوداری تورك و سەرۆكی سەندیكای نووسەرانی توركیا عەزیز نەسیندا ئەنجام بدەم. پێم وابێت لەو گفتوگۆیەدا زۆر شتمان بۆ یەكدی ڕوون كردەوە. ئەو گفتوگۆیەمان لە سەروبەندی كۆبوونەوەی دە ساڵەی دەستپێكی كولتوورەكاندا ئەنجام دا. دەستپێكی كولتوورەكان لەلایەن نەتەوە یەكگرتووەكانەوە ڕاگەیەندراوە.

دەمەوێت لەم ڕێككەوتەش واتایەكی سەمبولیك دەربهێنم؛ ئەم دە ساڵەی دوایی كە ئێمە لە سەد ساڵی ڕابردوو جیا دەكاتەوە، با بۆ گەلەكانمان ببێت بە ساڵی خۆشگوزەرانی، پەیوەندیی باش، ئاڵوگۆڕی كولتووری و ئاشتی. تەندروستی و سەركەوتنتان بۆ دەخوازم.

لوبۆمیر لەڤچەڤ

سەرۆكی یەكیەتیی نووسەرانی بولگارستان

# وەڵامی سەندیکای نووسەرانی تورکیا بۆ وەڵامەکەی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان

ب. لوبۆمیر لەڤچەڤ

سەرۆکی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان

بەرێز لەڤچەڤ...

ئەو نامەیەی بە سێ رێی جیاوازدا، لە رێی باڵیۆزخانەی بولگارستان لە ئەنقەرە و کۆنسوڵخانەی بولگارستان لە ئیستانبوڵ و بە پۆستدا بۆ ئێوەمان ناردبوو، 1988/5/16 وەڵامەکەیمان وەرگرتەوە. سوپاستان دەکەین.

بەش بەش وەڵامی وەڵامنامەکەتان دەدەینەوە:

1- بیرمان لەوە کردەوە لەوانەیە ناردنی نامەکان تەنها بە پۆست بۆ ناوونیشانەکەی ئێوە گومان دروست بکات، بۆیە بە باشمان زانی دوو دانەیتان لە رێی کۆنسوڵخانەتان لە ئیستانبوڵ و باڵیۆزخانەتانەوە لە ئەنقەرە بۆ بنێرین. ئەگەر سەرباری ئەوەش نامەکەی ئێمە درەنگ گەیشتبێت بەدەستتان، بەرپرسیاریی ئەو دواکەوتنە زیاتر دەکەوێتە ئەستۆی کۆنسوڵخانە و باڵیۆزخانەی خۆتان. (پسوولەکانی پۆستمان لای خۆمان پاراستووە.)

2- دەڵێن یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان لە رۆژگارە دژوارەکانی نووسەرانی تورکیادا لە پشت سەندیکای نووسەرانی تورکیا بووە. راستە. لە پای ئەمە سوپاستان دەکەین. تەنیا لە نێوان نووسەرانی تورك و بولگاردا نا، بگرە پشتیوانی و پشتگرتنی یەکتری رێکخراوەکانی نووسەران لە وڵاتانی هاوچەرخ و خاوەن شارستانی ئەرك و لێپرسراویی نووسینە. تەنیا پشتیوانیی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان نا، پشتیوانیی رێکخراوەکانی نووسەرانی ئەڵمانیای فیدراڵی، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، فەرەنسا، بەریتانیای گەورە، یۆنانستان و چەندین وڵاتی تریشمان دی و ئێمەش وەك سەندیکای نووسەرانی تورکیا لە کاتی پێویستدا، چەندی لە دەستمان هاتبێت، پشتیوانیمان لە رێکخراوەکانی نووسەران لە وڵاتانی تر کردووە.

3- لە نامەکەتاندا دەڵێن "هاووڵاتیانی کۆماری میللیی بولگارستان، ئاینیان هەرچییەك بێت، هەموویان خاوەنی مافی یەکسانن. لە خۆیان بترازێت، کەسی تر مافی ئەوەی نییە ئەوان بخاتە سەر کۆمەڵی تر، یان چوارچێوەی سنوورگەلی ترەوە."

چەند جێگەی داخە، ناچارین بە خەمگینی بڵێین ئەم قسەیە لە گشت زمانێکی جیهانیدا توندترین دیماگۆجییە. لە هیچ جێیەکی نامەکەی ئێمەدا باسی ئاین نەکراوە. باس لەوەش نەکراوە هاووڵاتیانی بولگار بخرێنە سەر کۆمەڵی تر، یان چوارچێوەی سنوورگەلی ترەوە. وەك چۆن ئێوە خوازیاری ئەمە نین، ئێمەش بەهیچ جۆرێك شتی وامان ناوێت. با راشکاوانەتر بڵێین: خوازیاری تێکدانی سنوورەکانی کۆماری میللیی بولگارستانیش نین و نامانەوێت هاووڵاتیانی بولگارستان بخرێنە سەر کۆمەڵی تر و چوارچێوەی سنوورگەلی ترەوە. هیچ کەسێکیش نییە شتی وا بڵێت و بخوازێت. ئەو قسەیەشتان کە دەڵێن "لە خۆیان بترازێت، کەسی تر مافی ئەوەی نییە"، نمایشێکی دیموکراسییە و بەهیچ شێوەیەك

لەگەڵ ڕاستیدا یەك ناگرێتەوە. وەك کەسانی زۆر شارەزای بولگارستان دەڵێین هاووڵاتیانی بولگارستان خۆیشیان ئەو مافەیان نییە. بەڵام داخوازی و پرس ئەوە نییە. ئێمە ڕوون و ئاشکرا ئەمەمان بۆتان نووسی! لە بولگارستان زیاد لە ملیۆنێك هاووڵاتی بولگارستانیی بەڕەچەڵەك تورك دەژین. حکوومەتی بولگارستان و بە تایبەتیش حکوومەتی ئێستای تۆدۆر ژیڤکۆڤ بەزۆر – بەڵێ، بەزۆر و بێ ویستی خۆیان – و بە گوشار ناوی تورکیی هاووڵاتیانی بولگارستانیی بەڕەچەڵەك تورك دەگۆڕێت و ناوی بولگارییان لێ دەنێت. سەرجەم بڵاوکراوە تورکییەکان و بە تورکی قسەکردنی هاووڵاتیانی بولگارستانیی بەڕەچەڵەك تورك قەدەخە کراون و پەروەردەی تورکی لە تورکەکان قەدەخە کراوە. ئاشکرایە گشت ئەم ڕەفتارانە پێچەوانەی دیموکراسی، مافەکانی مرۆڤ و مرۆڤایەتین. ئەم شتانە ڕوو دەدەن و هیچ ڕەهەندێکیان تێدا نییە هی ئەوە بێت مشتومڕی لەسەر بکرێت. ئایا ئێوە وەك یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان لە بەرامبەر ئەو هەموو ڕەفتارە نامرۆییانە چی دەڵێین و چۆن بیر دەکەنەوە؟ گەلۆ ڕەفتارەکان بە ڕاست دەزانن و پەسەندیان دەکەن، یان بە ناڕەوایان دەزانن و لە دژیان ڕادەوەستن، یاخۆ پێتان ناڕەوایە و لەبەر گوشار و پاڵەپەستۆی سەرتان ناچارن بێدەنگ بن لە ئاستیاندا؟ ئێمە ویستبوومان ئەمەمان بۆ ڕوون بکەنەوە.

هیچ کەسێك لە هەوڵی ئەوەدا نییە هاووڵاتیانی بولگارستان چ لە ڕەچەڵەکی بولگار و چ لە ڕەچەڵەکی تورك بخاتە سەر کۆمەڵی تر، یان بخاتە چوارچێوەی سنوورگەلی ترەوە. لە کاتێکدا ڕەوش بەم جۆرە بێت، ورووژاندنی باسی ئاین و سنوور لەلایەن ئێوەوە چەواشەکردن و بەلارێدابردنی بابەت نەبێت، هیچ شتێکی تر نییە.

4- لە وەڵامەکەتاندا دەڵێن "دەوڵەتی ئەمڕۆی تورك بە کردەوە داکۆکی لەو تێگەیە دەکات کە ئاینی ئیسلام ئاینی نەتەوەی تورکە " و " هەوڵی تورکیا بۆ داکۆکیکردن لە موسڵمانەکانی بولگارستان پێچەوانەی یاساکانە، دووربینانە نییە و پەلامارێکی زەقە بۆ سەر مافەکانی مرۆڤ."

ئەم قسانە وەك ئەوە وان وەڵام نەبن بۆ نامەکەی ئێمە، بگرە وەڵام بن بۆ نامەیەکی تری زۆر جیاواز. ئێمە وەك نووسەران لەبەر ئەوەی لە حکوومەتی تورکیا بەرپرسیار نین، نە باسی حکوومەتی تورکیا و نە باسی حکوومەتی بولگارستانمان بۆ ئێوە نەکردووە. ئێوەی نووسەرانی بولگاریش لە حکوومەتی بولگارستان بەرپرسیار نین. بەجۆرێك وەڵامی ئێمەتان داوەتەوە وەك ئەوەی حکوومەتی بولگارستان بن. واز لە حکوومەتەکان بهێنن، با خۆیان دوو بەدوو کارەکانی دەسەڵاتداری بەڕێوە ببەن، گفتوگۆ بکەن و ڕەخنە بگرن. ئێوە وەك یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان بۆچی ئەرکەکانی حکوومەتی بولگارستان دەخەنە ئەستۆی خۆتان؟

ئێمە وەك نووسەرانی تورکیا بەرگری نە لە موسڵمان، نە لە ئۆرتۆدۆکس، نە لە جوولەکە و نە لە بێ ئاینەکانی بولگارستان ناکەین. ئەم بابەتانە لە دەرەوەی بایەخ پێدانی ئێمەن. بەڵام ئێمە وەك مرۆڤ، پاراستنی مرۆڤ بە ئەرکی خۆمان دەزانین و پێویستە ئەرکی ئێوەش بێت. ئەو مرۆڤانە لە بولگارستانی وڵاتی ئێوە بێ ویستی خۆیان و بەزۆر ناو، ناوبانگ، دابونەریت، کولتوور، ئاین و زمانیان دەکرێت بە بولگاری. مەسەلەکە زۆر ڕوون و ئاشکرایە! ئەو ڕاستییە لەبەر چاوان ڕوو دەدات و ئێوەش هەوڵ دەدەن چەواشەی بکەن. مەحاڵە ئەمە لەگەڵ شکۆی نووسیندا یەك بگرێتەوە.

5- بەمەبەستی ئەوەی هاوڕێ بۆ ناڕەواییی خۆتان پەیدا بکەن، بێ ئەوەی پێویست بکات و لە جێی خۆیدا بێت، چەند بابەتێکی وەك "کێشەی قوبرس"، "تراجیدیای قوبرس"، "پرسی کورد" و "قڕکردنی ئەرمەنی"تان تێکەڵ کردووە (سەرمان لەوە سووڕماوە بۆچی شتی تریشتان لێ زیاد نەکردووە) و لە نامەکەتاندا دەڵێن "ئێمە بەگەرمی پشتیوانی لە سیاسەتی یەکیەتیی کۆمارە سۆسیالیستەکانی سۆڤیەت و گۆرباتچۆف دەکەین."

ئەم ڕستەیە لەناکاو پێکەنین دەخاتە سەر لێو و بەڵگەی بێچارەییی ناڕەوابوونتانە. پشتیوانی لە کێ دەکەن، بیکەن. ئەمە کێشەی ئێمە نییە، هی ئێوەیە. ئەمە بە ئێمە و کەسانی تر چی؟ بۆچی زۆرمان لێ دەکەن و هەوڵ دەدەن ئێمەش بۆ ناو سیاسەتی ڕۆژانە بەکێش بکەن؟ ئایا بۆ ئەوەی پشتیوانی پەیدا بکەن؟ ئەو هاوڕێ گۆرباتچۆفەی ئێمە دەیناسین، هیچ خۆشحاڵ نابێت بەم دەست لە کار وەردانە نابەجێیەی ئێوە. بەڵام نەخێر، زۆرتان بۆمان هێنا و ناچارمان دەکەن وەڵامتان بدەینەوە. بۆچوونی ئێمە لەو ڕووەوە بەم جۆرەیە:

باشە، ئەمڕۆ بەگەرمی پشتیوانی لە یەکیەتیی کۆمارە سۆسیالیستەکانی سۆڤیەت و گۆرباتچۆڤ دەکەن، بەڵێ زۆر ڕاستە، کتومت وەك ئەوەی پێش گۆرباتچۆف بەگەرمی پشتیوانیتان لە بریجنێڤ و پێش ئەویش و بەهەمان گەرم و گوڕی پشتیوانیتان لە ستالین کرد. ئایا دەتوانن بڵێن ئەمانە درۆن؟ خێرە قسە دەبەنەوە سەر ئەو ڕووداوە مێژووییانە؟ خۆ ئەو ڕووداوانە هیچ پەیوەندییان بە مەسەلەکەی ئێمەوە نییە! ئەمانە چ سوودێکیان بۆ کێ دەبێت؟ ئایا ڕزگارتان دەکات لە بەرپرسیاریی ئەو ڕەفتارە نامرۆییانەی کە ئەنجام دەدرێت؟

بەگەرمی پشتیوانیکردن، یان نەکردن لە یەکیەتیی کۆمارە سۆسیالیستەکانی سۆڤیەت و گۆرباتچۆڤ و حکوومەتەکانی خۆتان، کێشەی ئێوەیە. هەڵوێستی ئێمە لەو بارەیەوە بەم جۆرەیە: سەندیکای نووسەرانی تورکیا وەك ڕێکخراو هەموو کاتێك هەڵوێستی ڕەتکەرەوانەی خۆی کە پێداویستییەکی پیشەی نووسینە، پاراستووە و سازشی بۆ حکوومەتی ئەمڕۆی تورکیا و حکوومەتەکانی پێش حکوومەتی ئەمڕۆش نەکردووە. ڕێکخراوەکەمان بە ڕێچکەی دەسەڵاتدا نەڕۆیشتووە و نەیویستووە کەڵك لە خێر و بێرەکانی دەسەڵات وەربگرێت.

باسی کێشەکانی قوبرس و کورد و ئەرمەنیتان کردووە. ئەگەرچی ئەمە پەیوەندیی بە بابەتەکەی ئێمەوە نییە، بەڵام با بۆچوونی خۆمانتان لەو بارەیەوە بۆ باس بکەین:

لە سیاسەتی قوبرسدا، ئێمە لەگەڵ سیاسەتی فەرمیدا کۆك نین.

لە پرسی کوردیشدا بۆچوونمان هاوڕای سیاسەتی فەرمیی دەوڵەت نییە. سەرۆکی گشتیی سەندیکای نووسەرانی تورکیا لەبەر ئەوەی بۆچوونی خۆی لەو بارەیەوە نووسی و بڵاوی کردەوە، لەلایەن دادگەی تەناهیی دەوڵەتەوە دادگایی کرا و بێتاوان دەرخرا.

لە مەسەلەی ئەرمەنیشدا هەم هاوڕای سیاسەتی فەرمیی دەوڵەت نین و هەم هاوڕای پڕوپاگەندەکانی ئەرمەنی نین کە بە هاندانی ئیمپریالیزم دەکرێن.

6- لە نامەکەتاندا هەڕەشەیەکی لەم بابەتەش هەیە:

"گواستنەوەی ئەو کێشە بێ بناغەیە بۆ سەکۆ نێودەوڵەتییەکان، وەك ئەوەی لە نامەکەتاندا نووسیوتانە، هەل بۆ ئێمەش دەڕەخسێنێت بەدەر لە ویستی خۆمان لەبەر چاوی هەموو جیهان باس لە مێژووی بولگارستان و مافەکانی گەلی بولگار بکەین."

لە پەنای ئەم هەڕەشە قورسەدا بەرتیلی سیاسیشمان دەدەنێ:

ئەگەر ئێمە ئەم کێشەیە نەگوازینەوە بۆ سەکۆ نێودەوڵەتییەکان و پێی ڕازی بین، ئێوە وەك بەرتیل پاشگەز دەبنەوە لەوەی لەبەر چاوی هەموو جیهان باس لە مێژووی بولگارستان و مافەکانی گەلی بولگار بکەن.

ئێمە، ئێوەمان وەك نووسەر ناسیبوو؛ بەڵام ئەگەر سەیری ئەو سەودا و مامەڵە سیاسییە پێشنیازکراوەتان بکرێت، کەمتر وەك نووسەر و زیاتر وەك سیاسەتوان و دیپلۆماتکار دێنە بەر چاو.

ئێمە لای خۆمانەوە بابەتەکە دەگوازینەوە بۆ سەکۆی نێودەوڵەتی و ئامادەشین بۆ ئەم هەنگاوە.

پێشنیازی ئێمە بەم جۆرەیە:

با حکوومەتی بولگارستان مۆڵەت بدات ڕێکخراوەکانی نووسەران (یەکیەتی، سەندیکا و یانەکانی PEN)ی یەکیەتیی سۆڤیەت، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەڵمانیای فیدراڵی، ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات، بەریتانیای گەورە، فەرەنسا، ئیتالیا، یۆنانستان و هەر وڵاتێکی تر ئێوە بخوازن و ئێمەی نووسەرانی تورك و ئێوەی نووسەرانی بولگارستان لیژنەیەکی هاوبەش پێك بهێنین بۆ ئەوەی بە ئازادی لەو مەسەلەیە بکۆڵینەوە و لێی ورد ببینەوە. ئێمە، ئەمەمان دەوێت!

بە پێچەوانەی چەواشەکاریی ئێوەوە، بابەتەکە بەهیچ جۆرێك پەیوەندیی بە موسڵمانی و سنوور و گۆرباتچۆڤ و مافە مێژووییەکانی بولگارستانەوە نییە. هاوڕێیانی نووسەری بولگارستانی، دەست لە مێژوو هەڵبگرن و وەرنەوە سەر باسی جوگرافیا... جوگرافیا... دەتانەوێت بە بەرچاوی جیهانەوە باسی مێژووی بولگارستان بکەن. بیکەن. ئایا هیچ تەگەرەیەك لەسەر ڕێتان هەیە بۆ ئەو کارە؟ یان دەتانەوێت بۆ ئەو قسەکردنە مۆڵەت لە ئێمە وەربگرن؟

ئەوەی پێویستە بزاندرێت، ئەمەیە: نرخی جوگرافیا بە مێژوو نا، هەر بە جوگرافیا دەدرێت.

نەتەوەیەك چەند گەورەش بێت، مێژووی ئەو نەتەوەیە بەهەمان گەورەیی پەڕەی وەهای تێدایە کە مایەی شانازی و پەشیمانیش بێت. نەتەوەی تورکیش نەتەوەیەکی گەورەیە و بەشی ئەوە پێ گەیشتووە تا بزانێت هەم بە شانازی و هەم بە شەرمەوە حسێب و نرخی مێژووی خۆی بدات.

7- لە نامەکەتاندا دەڵێن "پڕوپاگەندەی ڕانەوەستاوی دژە بولگاری ئیمپریالیستەکان بەشێوەیەکی نەرێنی کاری لە ئێوەش کردووە."

وەك ئەوەی پەنابردن بۆ بابەت و کێشەکانی وەك قوبرس، کورد، ئەرمەنی، موسڵمانی، گۆرباتچۆڤ و حسێبە مێژووییەکان بەس نەبن بۆ داکۆکیکردن لە ڕەفتارە ناڕەوا و نامرۆییەکان، ئەمجار خۆتان وەك دژبەری ئیمپریالیزم پێشان دەدەن و تەنانەت ناڕاستەوخۆ چاوەڕێی پشتیوانی لە ئیمپریالیزم دەکەن. ئێمەی نووسەرانی تورك، بە ئاسوودەییی خۆ بە مافدار زانینمانەوە بابەتەکە ئاوەژۆ ناکەینەوە و هیچ بە شتێکی گونجاوی نازانین باس لەم هەڵوێست و لەو بۆچوونی حکوومەتی بولگارستان بکەین و ڕەخنەی لێ بگرین.

ئێوەی نووسەرانی بولگار وەك گۆڤانی (شایەت) هەڵوێست و وتاری نووسەرانی تورك لە کۆبوونەوە جیهانییەکانی نووسەراندا زۆر باش دەزانن ئەگەر نووسەرانی تورك، بکەونە یان نەکەونە داوی گەمەی ئیمپریالیزمەوە، نە پڕوپاگەندەی بەرگریکاران لە ئیمپریالیزم و نە بانگەشەی داکۆکیکارانی ئەو ڕەفتارە نامرۆییيانەی ئەو سیستەمەی خۆی وەك سۆسیالیزم دەخاتە ڕوو، کار لە ئێمە ناکات. ئەم جۆرە چەکانەی تۆقاندن و هەرسکردن زۆر لە مێژە مۆدەیان بەسەرچووە.

8- باس لەو گفتوگۆیە دەکرێت کە لە مۆسکۆ لە نێوان سەرۆکی سەندیکای نووسەرانی تورکیا عەزیز نەسین و سەرۆکی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان بەڕێز لوبۆمیر لەڤچەڤدا بەڕێوە چووە. ئەو گفتوگۆیە لەسەر بانگهێشتی عەزیز نەسین و لە ژووری نەسین لە هۆتێل و بە ئامادەبوونی وەرگێڕان و بە بەرچاوی گۆڤانەکانەوە ئەنجام درا. عەزیز نەسین لەو دیمانەیەدا نووسراوەکانی ناو نامەی یەکەمی ئێمەی بەشێوەیەکی فراوانتر خستبووە ڕوو، بەڵام لەو گفتوگۆیەدا کە ماوەی سێ سەعات و نیوی خایەند، لەڤچەڤ بانگەشەی مێژوویی کرد و هیچ یەکێك لە بانگەشەکانی مایەی بڕوا پێکردن نەبوون و نەدەکرا بە بەڵگە دابنرێن. سەرەڕای ئەوەش، وەك هیوا و ئاواتی هەمیشەییمان ئەو گفتوگۆیەش لە کەشێکی دۆستانەدا بەڕێوە چوو و لای ئێمە ئومێدی لەیەکگەیشتنی بووژاندەوە.

دوای ئەو لێدوانانەی سەرەوەمان کە بەهیواین هەمووتان بیانخوێننەوە، بڕیاری خۆمان ڕادەگەیەنین:

1- سێ بەڵگەی پێکهاتوو لە نامەی یەکەممان بۆ ئێوە، وەڵامی ئێوە بۆ نامەی یەکەممان و ئەم نامەیە (بەزمانی ئینگلیزی) دەنێرین بۆ سەرجەم ڕێکخراوەکانی نووسەران لە جیهان (یەکیەتی، سەندیکا و یانەکانی PEN)، کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤی ئەوروپا، یەکیەتیی مافناسانی ئەوروپا، ڕێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوە هاوشێوەکانی تری نێودەوڵەتی.

2- لەو ڕێکخراوانەی سەرەوە دەخوازین داوا لە حکوومەتی بولگار بکەن مۆڵەت بدات بۆ پێکهێنانی لیژنەیەك تا بچێت لە شوێنی خۆی لە ڕووداوەکە بکۆڵێتەوە، توێژینەوە ئەنجام بدات و بڕیاری خۆی بدات.

3- تا کاتی پاشگەزبوونەوە لەو ڕەفتارە نامرۆییيانەی بولگارستان و تا کاتی دانانی سنوور بۆ بەزۆر گۆڕینی ناسنامە و کەسایەتیی هاووڵاتیانی بەڕەچەڵەك تورکی بولگارستان، سەرجەم ئەندامانی سەندیکای نووسەرانی تورکیا، چ وەك تاکەکەس و چ وەك ڕێکخراو هەموو پەیوەندییە کولتوورییەکانی خۆی لەگەڵ یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان ڕادەگرێت. ئەگەر تەنانەت نێزیکبوونەوەش لە نێوان هەردوو حکوومەتی تورك و بولگاردا بەبیانووی هەبوونی بەرژەوەندیی سیاسی، یان نەتەوەیی ڕوو بدات، بەڵام ئەو دۆخە باسکراوەی بولگارستان گۆڕانی بەسەردا نەیەت و هەردوولایەن ڕێز نەگرن لە مافەکانی مرۆڤ کە بناغەی دۆستایەتیی ڕاستەقینەیە لە نێوان هەردوو گەلی هاوسێدا، سەندیکای نووسەرانی تورکیا پەیوەندی بە یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستانەوە ناکات.

4- سەندیکای نووسەرانی تورکیا سەرجەم هونەرمەندان و زانایانی ئەندامی ڕێکخراوەکان و نائەندامان و ڕۆشنبیران بەگشتی و تەواوی ڕێکخراوەکانی کرێکاران ئاگادار دەکاتەوە و پێیان ڕادەگەیەنێت هەنگاوێکی گونجاو دەبێت ئەگەر ئەوانیش بەهەمان ڕێبازی سەندیکای نووسەرانی تورکیادا بڕۆن.

سەرۆك و نووسەرانی ئەندامی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان:

**ئومێدمان وایە نامەی پێشوومان و ئەم نامەیەشمان گەیشتبێت و بگات بە سەرجەم نووسەرانی بولگارستان. دلگرانین بەوەی پەیوەندییەکانمان کەوتووەتە ئەم ڕەوشەی ئەمڕۆوە کە هیچ کاتێك بەلای ئێمەوە خواستراو نەبووە. ئاواتمان ئەوەیە لە کورتترین کاتدا ڕاستی ببیندرێت و ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ بگیرێت.**

**عەزیز نەسین**

**سەرۆکی گشتیی سەندیکای نووسەرانی تورکیا**

## کۆنگرەی ڕۆژنامەوانی

1989/2/15، کۆمەڵەی ڕۆژنامەنووسان

**هاوڕێ ڕۆژنامەنووسە بەنرخەکانمان،**

**سوپاسی هەمووتان دەکەین لە پای بەدەنگەوەهاتنی بانگەوازی کۆنگرەی ڕۆژنامەوانیمان و بەشداربوونتان. بەخێر بێن.**

**بابەتی ئەم کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەمان بریتییە لە پێشاندانی نارەزایی خۆمان وەك سەندیکای نووسەرانی تورکیا لە دژی ڕەفتاری نامرۆیی، ناهاوچەرخ و ناشارستانیی پەیڕەوکراو دژ بە هاووڵاتیانی بەڕەچەڵەك تورکی بولگارستان کە لە پێنج تا دە ساڵی ڕابردووا زۆر پەرەی سەندووە.**

**وەك دەزانن کودەتای سەربازیی 1980/9/12 نەزمێکی دژ بە دیموکراسی لەگەڵ خۆیدا هێنا و بە درێژایی ئەو ماوەیە بەپێی یاسای کۆمەڵەکان کاری سیاسی لە کۆمەڵە و سەندیکاکان قەدەخە کرا. لەو ماوەیەدا بە یاسا لە سەندیکاکەمان قەدەخە کرابوو نارەزایی خۆی لە بەرامبەر ئەو ستەمەی لە هاوڕەگەزانی تورکی بولگارستان و لە بەرامبەر ئەو پاڵەپەستۆیەی دەخرێتە سەریان، دەرببڕێت. ئەگەرچی هەنگاوێکی نادیموکراسیش بوو، بەڵام بیرمان لەوە کردەوە چۆن بێ ئەوەی یاسا کارپێکراوەکان پێشێل بکەین، نارەزایی خۆمان پێشان بدەین؟ بە کۆی دەنگی ئەنجوومەنی بەڕێوەبەری سەندیکای نووسەرانی تورکیا بڕیارمان دا نامەیەك بۆ یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان بنووسین و بانگ لە نووسەرانی بولگار بکەین نارەزایی لە بەرامبەر ئەو ڕەفتارانەی پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤ دەربڕن کە ئەمڕۆ لە بولگارستان ئەنجام دەدرێن. پاش کەمێکی تر ئەو نامەیەی خۆمان و وەڵامی نەرێنیی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان و وەڵامی ئێمە بۆ نامەکەی ئەوانتان بۆ دەخوێنینەوە. ئەم نامەگۆڕینەوانە بێباکیی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان دەخاتە ڕوو لە بەرامبەر پاڵەپەستۆی پێشێلکارانەی مافی مرۆڤ و ستەم و کاری نابەجێی دژ بە هاوڕەگەزانی تورکی بولگارستان.**

**پێویستە ئەوەش بڵێین لە کاتێکدا ئەوەی چەندین ساڵە لە بەرامبەر تورکەکانی عێراق ئەنجام دەدرێت، زۆر قورسترە لەو ڕەفتارانەی کە دژ بە هاوڕەگەزانی تورکی بولگارستان ئەنجام دەدرێت، بەڵام حکوومەتەکانی تورك لە بەرامبەر بڕێك بەرژەوەندیی بازرگانی و وەرگرتنی نەوت بەردەوام بێدەنگ بوون لە بەرامبەر پەیڕەوکردنی سیاسیەتی توانەوە و لەناوبردنی هاوڕەگەزانی تورکی عێراق لەسەر دەستی دەسەڵاتی سەدام. لە ئەنجامی ئەو گوشارانەدا کە ئەمڕۆش درێژەیان هەیە (مەبەست کۆتاییی ساڵانی هەشتای سەدەی ڕابردووە... ئامادەکاران)، ژمارەی هاوڕەگەزانی تورك لە عێراق لە دوو ملیۆنەوە بووە بە چەند سەد هەزارێك.**

**نارەزاییی حکوومەتی تورکیا لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لە بەرامبەر ئەو ڕەفتار و کارە نامرۆییانەی کە لە بولگارستان دژ بە هاوڕەگەزانی تورك ئەنجام دەدرێن، تێرکەر و کاریگەر نەبووە، چونکە حکوومەتی بولگارستان دەقاودەق هەمان ئەو سیاسەتە لە دژی تورکەکانی بولگارستان پەیڕەو دەکات کە لە تورکیا لە دژی کورد پەیڕەو دەکرێت. حکوومەتی تورکیا لەم ڕەوشەدا ئەگەر تەنانەت هەندێك نارەزاییی ڕووکەشانە پێشان بدات و پێشانیشی دابێت، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی ناتەواو و بێ کاریگەری ماوەتەوە و دەمێنێتەوە.**

**چۆن لە تورکیا تێگەیەکی مێژوویی وەك "گەلێك نییە بەناوی کوردەوە، کورد بەرەچەڵەك تورکن" خراوەتە ڕوو، بولگارستانیش بە تێگەیەکی مێژوویی دەستکردی هاوشێوە کە دەڵێت "لە بولگارستان تورك نییە، ئەمانە بەرەچەڵەك بولگارن؛ بولگاری بە موسڵمانبوون"، بەزۆر و لە ژێر پاڵەپەستۆدا هاوڕەگەزانی تورکی بولگارستان دەکات بە بولگار.**

**بەپێی چەمکی نەتەوەپەرستیی هاوچەرخ، کەسانی تر بۆیان نییە چ بە پشتبەستن بە مێژووی ڕاستەقینە و چ بە تێگەیەکی مێژوویی دەستکرد بڕیار لەسەر پەیوەندارییی هیچ مرۆڤێك بەهیچ میللەتێکەوە بدەن. مرۆڤ خۆی ئازادە لە دەستنیشانکردنی ناسنامە و کەسایەتیی خۆی؛ واتا مرۆڤ تەنیا خۆی دەتوانێت بڕیار بدات سەر بە چ میللەتێکە و دەبێت بە هاووڵاتیی کام دەوڵەت. گۆڕینی نەتەوەی مرۆگەل بە گوشار و زۆرداریی بنیاتنراو لەسەر بنەمانی تێگەیەکی مێژوویی دەستکرد لەلایەن حکوومەتەکانەوە و بێ خواستی مرۆگەل خۆیان، ڕەفتاری ناهاوچەرخ و ناشارستانیی و دژبەری مرۆڤایەتییە.**

**ئەندامانی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان ناڕەزایی لە بەرامبەر ئەم سیاسەتەی حکوومەتی ژیفکۆڤ پێشان نادەن و ئێمە لە پای ئەو هەڵوێستەیان سەرکۆنەیان دەکەین.**

**وا دەردەکەوێت حکوومەتی ئەمڕۆی بولگارستان بە سەرۆکایەتیی ژیفکۆڤ خوازیارە ناڕەزاییە ڕووکەش و ناکاریگەرەکانی حکوومەتی تورك بۆ زەمانە بهێڵێتەوە و پەردەپۆشیان بکات و بە تێپەڕبوونی کات نەرمیان بکاتەوە و لە بیری ڕای گشتیی جیهانیان بباتەوە.**

**دەمانەوێت ڕای بگەیەنین پەیوەندیی نێوان حکوومەتەکان بە تێپەڕبوونی هەر ڕەوتێك و چ شێوازێك بگرێتە بەر، تا سنوورێك دانەنرێت بۆ نارەوایی پەیڕەوکراو لە دژی تورکە هاوڕەگەزەکانی بولگارستان، یان تا یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان لە بەرامبەر ئەو ناڕەواییە هەڵوێست وەرنەگرێت و ناڕازیبوون پێشان نەدات، ئێمە وەك نووسەرانی ئەندامی سەندیکای نووسەرانی تورکیا هیچ پەیوەندییەکی کولتووری، هونەری و ئەدەبیمان لەگەڵ بولگارستان و نووسەرانی بولگاردا نابێت. ڕێکخراوەکانی هونەر و کولتوور و زانیاری و ئەدەبی تری تورکیاش ئاگادار دەکەینەوە تا ڕەوشی هەیی نەگۆڕدرێت، پەیوەندی بە بولگارستانەوە نەکەن.**

**مافی کەمینە نەتەوەکان بەتەنیا لە تورکیا و عێراق و بولگارستان حسێبی نەبووی بۆ ناکرێت. لە نووسراوێکدا کە لە یەکیەتیی نووسەرانی مەجەڕستانەوە بۆمان هاتووە، ئاماژە کراوە بۆ گوشار و ستەمی چاوشێسکۆ لە دژی مەجەرەکانی ڕۆمانیا.**

**ئێمەی ئەندامانی سەندیکای نووسەرانی تورکیا دەخوازین سەرجەم مرۆڤەکانی جیهان وەك چۆن ئاینی خۆیان هەڵبژاردووە، بەهەمان شێوەش خۆیان نەتەوەی خۆیان هەڵبژێرن و خوازیارین تورکە هاوڕەگەزەکانی بولگارستان وەك هاووڵاتیی بولگارستان بمێننەوە، بەڵام لە کولتووری خۆیان دانەبڕدرێن، لە زمانی زگماکیان بێبەش نەکرێن و بەزۆر و لە ژێر گوشاردا لە دابونەریتەکانیان دانەماڵدرێن.**

**بەتایبەت ئەم ڕاگەیەندراوە و نامەکانمان دەنێرین بۆ سەرجەم ڕێکخراوەکانی نووسەران لە جیهان و بۆ هەموو ڕێکخراوەکانی تایبەتمەند بە مافی مرۆڤ و بەناوی مرۆڤایەتییەوە داوای پشتیوانی و هەماهەنگییان لێ دەکەین.**

**هاوڕێ ڕۆژنامەنووسە بەنرخەکانمان، ئێستا نامەکانی نێوان خۆمان و یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان دەخوێنینەوە.**

**لە پای سەرنجدانتاندا سوپاستان دەکەین.**

**بەهیواین ڕۆژنامەکانتان جێی پێویست بۆ ئەم بابەتە گرنگ و ژیارییە تەرخان بکەن. لەگەڵ سوپاسماندا.**

سەرۆکی گشتیی سەندیکای نووسەرانی تورکیا

عەزیز نەسین

تێبینی: ڕۆژنامەنووسان بایەخێکی زۆریان بەم کۆبوونەوەیەمان دا. بەڵام بەداخەوە لە ڕۆژنامەکاندا جێ بە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەمان نەدرا. تەنیا ڕۆژنامەیەك وەك هەواڵێکی زۆر بچووك جێی بۆ کردبووەوە.

## نامەی نێردراو بۆ ڕێکخراوەکانی نووسەران لە جیهان

زیاد لە ملیۆنێك هاووڵاتیی بەڕەچەڵەك تورکی بولگارستان ماوەی شەش ساڵ زیاترە لە ژێر ستەم و گوشاری دەوڵەتدا دابونەریت، کولتووریان، ناوەکانیان، ئاین و زمانیان دەگۆڕدرێت و بێ ویستی خۆیان دەخرێنە بۆتەی ناسنامە و کەسایەتیی بولگارەوە.

ئێمە وەك ئەندامانی سەندیکای نووسەرانی تورکیا نامەمان بۆ یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان نووسی و ویستمان هەڵوێست و کرداریان لە بەرامبەر ئەو هەڵوێستە پێشێلکارەی دیموکراسی و ماڤی مرۆڤ بزانین.

نامەی باسکراومان و وەڵامنامەی یەکیەتیی نووسەرانی بولگارستان و وەڵامنامەکەی خۆمان لەگەڵ ئەم نامەیەدا دەخەینە ڕوو.

پاش خوێندنەوەی نامەکان، بارودۆخەکەتان زۆر بەتەواوی بۆ ڕوون دەبێتەوە.

وەك ڕێکخراوی هاوپیشە بەسەرتان دەکەینەوە. ئاواتمان ئەوەیە هاودەنگی ئەو لایەنە ب کە بە مافداری دەزانن و هەموومان پێکەوە بەرگری لە دیموکراسی و ماڤی مرۆڤ بکەین.

پێشنیازمان سەبارەت بەم بابەتە بەم جۆرەیە:

حکوومەتی بولگارستان مۆڵەت بدات نووسەرانی ڕێکخراوەکانتان ماوەیەك لە بولگارستان توێژینەوە ئەنجام بدەن تا لە شوێنی خۆی لە بابەتەکە بکۆڵنەوە و بڕیاری خۆیانی لەسەر بدەن. ئەگەر بە پێویستی بزانن، نووسەرانی تورکیش دەتوانن لەو گەشتی لێکۆڵینەوەیەدا لەگەڵتاندا بن. بە کارێکی سوودمەندی دەزانین ئەگەر نووسەرانی بولگاریش بەشدار بن.

هیوامان وایە ببن بە هاوکار بۆ ئەم هەوڵەمان و چاوەڕێی وەڵامتان دەکەین.

سوپاستان دەکەم و ڕێزی خۆم دەگەیەنم.

عەزیز نەسین

سەرۆکی گشتیی سەندیکای نووسەرانی تورك

## کورد له تورکیا:

**ئەو وتارەی کە بوو بە هۆی کردنەوەی دۆز لەسەر پرسی کورد**

رۆژێکی سەرەتای مانگی هەشتی ساڵی 1987 لە گۆڤاری "ئیکیبینە دۆغرو"وە (بە کوردی واتای بەرەو دوو هەزار، یان ڕاست بەرەو دوو هەزار دەگەیەنێت... ئامادەکاران) تەلەفۆنم بۆ کرا بۆ وەقفی نەسین لە چاتلاجە و پرسیاری ئەوەم لێ کرا بۆچوونم چییە سەبارەت بە پرسی کورد وەك پرسێکی گرنگ و ڕۆژانەی تورکیا. بە تەلەفۆن وەڵامی ئەو پرسیارەم دایەوە و وەڵامەکەم ڕۆژی 1987/8/9 لە گۆڤاری "ئیکیبینە دۆغرو"دا بڵاو کرایەوە. وەڵامە بڵاوکراوەکەم ئەمە بوو:

تا ئەم یاسایانە هەبن، بوار نییە بۆ بەڕاشکاوی قسەکردن سەبارەت بەم بابەتە. هەر ئەو یاسایانەن پرسی کوردیان خوڵقاندووە و تواناکانی چارەسەرکردنی پرسەکەیان لەناو بردووە. بە بۆچوونی من، ئەوەی پێویستە ئەمڕۆ وەك هەنگاوی یەکەم ئەنجام بدرێت، خستنەڕووی پووکاوەیی و بەسەرچوویی ئەو یاسایانە و گۆڕینیانە. نامەوێت بە ئاشکرا تاوان ئەنجام بدەم؛ ئەو مرۆگەلەی ئەمڕۆ دەستیان داوەتە شەڕی چەکداری، شتێکی زۆر بەجێ نابێت ئەگەر بڵێین یاساکان بۆ ئەوان زۆر بێکەڵك بوون و قسەیەکی لەم جۆرە بوار بۆ لێکدانەوەی هەڵە دەڕەخسێنێت. بۆیە سەردەمێکی ئارامتر پێویستە بۆ زیاتر بەڕاشکاوی قسەکردن. لە کاتێکدا کورد بەدەستی کورد دەکوژرێت و کورد، تورك دەکوژێت و سەرباز دەکوژرێن و ئەوانیش دەکوژن، زەمانی دۆزینەوەی چارەسەر زۆر دواکەوتووە. بە مەرجی مانەوە لە چوارچێوەی یاساکاندا دەتوانم ئەمە بڵێم: گەورەترین هەڵە ئەوەیە نکۆڵی لە سەرلەبەری گەلێك بکرێت. لە کۆکەوە نکۆڵی لەو گەلە کراوە. چەندین ساڵە بە ڕێبازی یاسایی نکۆڵی لە هەبوونی دەکرێت. هەمان گەمە بەسەر ئێمەش هات. بولگارەکان بەهەمان فەلسەفە حسێبی نەبوو بۆ تورکەکانی ئەوێ دەکەن. لەبەر ئەوەی ئێمەش هەمان شت دەکەین، ناتوانین هەڵوێستێکی ئاشکرا و ڕوون لە بەرامبەر ڕەفتارەکانی بولگارستان وەربگرین. هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە بە گەلێك بڵێت "ڕەچەڵەکی تۆ ئەوە نییە، ئەمەیە." پێویستە شتی وا نەبێت.

با ڕاشکاوانە بڵێم گەلێك هەیە بەناوی گەلی کورد. من تێکۆشانی سەربەخۆیی گەلی کورد وەك تێکۆشانی سەربەخۆیی کولتوور تێ دەگەم. لایەنگری سەربەخۆیی سیاسی نیم. ئەمەم تەنیا لەبەر ئەوە نییە کە لە بەرژوەندیی تورکیایە، بگرە بەرژوەندیی کوردیش هەر لەمەدایە. لە کاتێکدا تەنانەت کۆماری تورکیا خۆیشی تەواو سەربەخۆ نییە، دروستبوونی هەرێمێکی سەربەخۆ لە ڕۆژهەڵات (کوردستانی تورکیا... ئامادەکاران) و مانەوەی بە سەربەخۆیی مەحاڵە. واتا کورد نابێت بۆ ڕیش بچن و سمێڵیشی بخەنە سەر. بزووتنەوەکان ئەگەر زۆر ئابڕوودار و سەرڕاستیش بێنە بەرچاو و لە بنەڕەت و ناوەڕۆکیشدا وا بن، هێزە دەرەکییەکان ڕۆڵێکی زۆر گەورە دەگێڕن لە ئاڕاستەکردنیاندا. هێزە ئیمپریالیستییەکان وەك ئەتاری گەمە بە تورکیا دەکەن. ناکۆکیی تورکیا-یۆنانستان، پرسی ئەرمەنی، سەربەخۆیی کوردەکان و پەیدابوونی هەندێك قسەی سەبارەت بە هەبوونی مافمان لە موسڵ-کەرکوکدا هەریەکەیان کارتێکی ئەو گەمەی ئەتارییەن. هێزە ئیمپریالیستییەکان بەپێی هەلومەرج هەر گەمەیەك لەوانەیان بوێت، دەیکەن. بۆیە من لەگەڵ ئەوەدام یاساکانی ئەمڕۆ بگۆڕدرێن و بێ

**هیچ مەرجێك هەبوونی گەلی كورد پەسەند بكرێت و سەرجەم مافە كولتوورییەكانیان پێ بدرێت. بەڵام باوەڕم بەوە نییە بانگەشەی سەربەخۆیی كوردەكان لە دڵەوە بێت. بزووتنەوەكە لە ڕووی هەڵەكانی لێپرسراوانی توركەوە بەو خاڵە گەیشتووە.**

**تیرۆر ڕێی بەرژەوەندی نییە. تیرۆری دژ بە تیرۆریش ڕێی بەرژەوەندی نییە. ئەمە سەربەخۆیی لێ ناكەوێتەوە و چارەسەریشی لێ بەرهەم نایەت. بەو ڕێبازانەش كە ئەمڕۆ دەوڵەتی تورك دەیانگرێتە بەر، كێشەكە چارەسەر نابێت. لەبەر ئەوەی یاساكانی ئەمڕۆ هەڵەن، شێوازەكانیش هەڵە دەبن. بەدرێژاییی ساڵان ڕایەكی گشتیی هەڵە خوڵقێندراوە. لە توركیا شتێك بەناوی حەز نەكردن لە كورد هاتە ئافراندن. گەورەترین هەڵە بریتییە لە داتاشین و خستنە ڕووی تێگەی مێژوویی "كورد بوونی نییە، ئەوانە توركن." بەپێی نەتەوەپەرستیی هاوچەرخ ناكرێت تۆ بە كەسێك بڵێیت نەتەوەی تۆ ئەمەیە. مرۆڤ خۆی بە ئەندامی چ میللەتێك بزانێت، لەو میللەتەیە.**

**ئێستا كێشەیەك هەیە: ئەگەر توركیا گەشەی بە هەرێمی ڕۆژهەڵات بدابایە، ئایا ملیان بۆ داخوازییەكانی ئەمڕۆیان دەدا، یاخۆ نا؟ ئەگەر دوای خۆشگوزەرانیی ئابووری مافە كولتوورییەكانیش بدرێت، پێویستیشە بدرێت، دەكرێت بارودۆخەكە بگەیەندرێتە خاڵێكی نەرمتر.**

**حكوومەتی ئەمڕۆ ناتوانێت كێشەكە چارەسەر بكات، چونكە حكوومەتێكە دوور لە ڕێبازی كاری زانستی. بە هەڵوێستی نازانستی چارەسەری ڕیشەیی بۆ چ كێشەیەك دەدۆزرێتەوە؟ ئەمە كێشەیەكی نوێش نییە. ئەگەر لە ڕابردوودا بە گرتنەبەری شێوازی زانستییانە چارەسەر بكرابایە، هەردوو گەل بە باشی چارەنووسی خۆیان یەك دەخست، پێكەوە دەژیان و كار نەدەگەیشت بەو ئاستەی كە ئەمڕۆ پێی گەیشتووە.**

**شتێكی ڕاستیش نییە ئەگەر گەلی كورد ئەو بزووتنەوانە بە هی خۆی بزانێت. بەڵێ بە كرۆك بزووتنەوەگەلی خۆیەتی، بەڵام باوەڕم وایە كۆمەڵێك هێزی دەرەكی هەن ئەو بزووتنەوانە هەڵدەسووڕێنن. ئەوانەی خوازیاری سەربەخۆیی كوردن، هەڵە دەكەن. بەڵام لە ڕاستیدا داواكارییەكانی تریان زۆر ڕاستە. ئەنجامی داوای سەربەخۆیی وەك ئەوەی لە ڕابردوودا ڕووی داوە، ئەوەیە سوپا دەچێتە ئەوێ و كۆتایی بە كارەكە دەهێنێت، ئازار دەگەیەنێت، بەڵام چی ڕوو دەدات؟: سوپای تورك دەبێت بە بكوژ، نەتەوەی تورك دەبێت بە ئیمپریالیزم. سوپا ناخوازێت بكەوێتە ئەو ڕەوشەوە. نایەوێت شەڕ ڕوو بدات. بگرە هێزە ئیمپریالیستییەكان ئەوەیان دەوێت و زەمینەی بۆ خۆش دەكەن. بۆیە پێویستە زۆر ئاقڵانە بیر بكرێتەوە. چ تورك و چ كورد پێویستە زۆر هۆشمەند بن. شەڕی سەربەخۆیی بەو جۆرە نابێت. بە كوشتنی ژن و منداڵ و پیاوی نەوەت ساڵان نابێت. ئەم ڕەفتارانە دنەی گەلی توركیش دەدەن. مرۆگەلی ئەوێ سەریان لێ شێواوە و نازانن چی بكەن و لە ژێر گوشاری هەردوولادان.**

**ڕێگەی چارەسەر بە پەسەندكردنی هەبوونی كورد و پەسەندكردنی ڕاستیی مێژوویی و زانستیدا تێ دەپەڕێت.**

## پرۆسەی کردنەوەی دۆزەکە

ڕۆژی 1987/8/18 لە وەزارەتی ناوخۆوە ئەم نووسراوە ئاراستەی وەزارەتی داد دەکرێت:

**کۆماری تورکیا**
**بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتی**
**سەرۆکایەتی هۆبەی تەناهی**

**ئەنقەرە**
198.../.../...

**ژمارە:...**
**بابەت: گۆڤاری بەناو "ئیکیبینە دۆغرو"**
241582 /17.08.87

**بۆ وەزارەتی داد**

**گۆڤاری بەناو "ئیکیبینە دۆغرو" کە هەفتانە لە ئیستانبوڵ دەردەچێت، لە لاپەڕەکانی 20، 21، 22 و 23ی ژمارەی 32ی 9-1987/8/15دا لە وتارێکدا بە ناوونیشانی "چارەسەر بۆ پرسی کورد"، بۆچوونی چەند کەسێکی بڵاو کردووەتەوە و لە هەواڵی بڵاوکراوەدا بەشێك بە سەردێڕی "شەڕی ڕزگاریی نەتەوەیی دەکەین" کە لەمەڕ هەمان بابەتە و تیایدا پشت بە لێدوانەکانی محەمەد عەلی ئایبار بەستراوە، بە (جالیبی دیققەت) سەرنجڕاکێش بیندراوە.**

**هەواڵەکانی ئەو گۆڤارە هەڵگری ڕەگەزی گەیاندنی زیان بە یەکیەتیی میللی و پێکەوە ژیانمان و تاودانی جوداخوازین، بۆیە بەڕێزەوە داواتان لێ دەکەین ڕێوشوێنی یاسایی لە دژی ئەو گۆڤارە و لێپرسراوانی و ئەوانەی لێدوانیان بۆی داوە، بگرنە بەر.**

**لەبری وەزیر**
**غالیب دەمیرەل**

★★★

ڕۆژی دواتر، (1987/8/19) وەزارەتی داد ئەم نووسراوەی خوارەوە دەنێرێت بۆ فەرمانگەی داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ و لەسەری دەنووسێت "زۆر بەپەلە"؛

کۆماری تورکیا

وەزارەتی داد

بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کاروباری سزا

ئەنقەرە

1987/8/19

ژمارە:...

بابەت: گۆڤاری بەناو "ئیکیبینە دۆغرو"

زۆر بەپەلە

بۆ فەرمانگەی داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ

نووسراوی ژمارە 241582ی وەزارەتی ناوخۆ لە 1987/8/17 لەگەڵ هاوپێچ لەگەڵ ئەم نووسراوەدا نێردراوە.

ئەگەر پێشتر هەر جۆرە ڕێوشوێنێك لە بەرامبەر ئەو گۆڤارە ناوهێندراوە گیراوەتە بەر، تکامان وایە چۆنایيەتی کارەکەمان بۆ بنێرن. ئەگەر نا، تکامان وایە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەن، زانیاریی بەپەلە سەبارەت بە ئەنجامی ڕێوشوێنەکان و نموونەی بڕیاری بەدوادانەچوون و داواکارینامەی ئەرێنیکراومان بۆ بنێرن.

لەبری وەزیر

کەنعان فەخری چاوگا

بەڕێوەبەری گشتیی کاروباری سزا

***

فەرمانگەی داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ ڕۆژی 1987/8/24 مامۆستای یاسای سزا لە کۆلێجی ماف و جێگری سەرۆکی زانکۆی ئیستانبوڵ پرۆفیسۆر د. کەیهان ئیچەل-ی وەك کەسی شارەزا (پسپۆر) بۆ دۆسییەکە دەستنیشان کرد.

**پرۆفیسۆر د. کەیهان ئیچەل ڕۆژی 1987/9/22 ئەم ڕاپۆرتەی خوارەی ئامادە کرد:**

**ڕاپۆرتی پسپۆر**

**بۆ  فەرمانگەی داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ**

**دۆسیەی ژمارە: 342/1987 هـ. ز**

**لە سۆنگەی ئەوەی وەك کەسی پسپۆر دامەزرێندرام بۆ دەستنیشانکردنی ئەوەی داخۆ وتاری بە سەردێڕی "چارەسەر بۆ پرسی کورد: بڕیاری هەستیار" کە لە لاپەڕەی 20 و لاپەڕەکانی دواتری ژمارە 32ی 9-1987/8/15ی گۆڤاری "ئیکیبینە دۆغرو"دا بلاو کراوەتەوە، پێچەوانەی مادەی 3/142یە لە یاسای سزای تورك، یاخۆ نا، لێکۆڵینەوەی پێویستم ئەنجام دا.**

**لە وتاری بابەتی لێکۆڵینەوەی مندا ئاماژە کراوە بۆ ئەوەی کە: توندوتیژی ناوبەناو گفتوگۆی لە ناو بردووە و هەندێك جاریش گفتوگۆی هێناوەتە ئاراوە؛ ئەو توندوتیژییەی لە تورکیا هەیە، لە ئاکامدا بووە بە هۆی تەقینی توورەکەی گوشار لەسەر و بەو هۆیەشەوە هەموو کەسێك بە پێویستی دەزانن کێشەیەکی سەرداپۆشراوی چەندین ساڵە تاوتوێ بکرێت. لە وتارەکەدا ڕوون کراوەتەوە ئەو بابەتە پرسی کوردە، بابەتێکی جدییە، گرنگترین کێشەی ڕۆژەڤی تورکیایە، ئاگری ڕۆژهەلات خەریکە هەموو ولات دەگرێتەوە و پێویستە مۆڵەت نەدرێت بە پەلکێشکردنی تورکیا بۆ ناو گێژەلۆکەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و دابڕینی لە سەرانسەری جیهان و پێویستە ڕێیەکی پتەو و جێی متمانە بگیرێتە بەر. پاشان لە وتارەکەدا بوار دراوە بە بۆچوونی چەندین کەس.**

**یەکەم بۆچوونی ناو ئەو وتارە بۆچوونی عەزیز نەسینە و ئەم کەسە دەڵێت: "باسکردنی ئەو بابەتە لە سایەی یاساکانی ئەمڕۆدا مەحاڵە، یاساکان توانای دۆزینەوەی چارەسەریان بۆ کێشەی کورد لەناو بردووە، ناخوازێت بەئاشکرا خۆی بخاتە خانەی تاوانکردنەوە، ئێستا کورد بەدەستی  کورد دەکوژرێت و کورد تورك دەکوژێت و سەرباز دێنە کوشتن و زەمانی چارەسەرکردن زۆر دواکەوتووە، گەورەترین هەڵە بریتییە لە نکۆڵێکردن لە گەل-ێك بەتەواوی، هەمان گەمە بەسەر ئێمەش هات، بولگارەکان بەهەمان فەلسەفە حسێبی نەبوو بۆ تورکەکانی ئەوێ دەکەن، لەبەر ئەوەی ئێمەش هەمان شت دەکەین، نەمانتوانیوە هەڵوێستێکی ڕوون و ئاشکرامان هەبێت، هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە بە گەل-ێك بڵێت "ڕەچەڵەکی تۆ ئەوە نییە، ئەمەیە"، گەل-ێك هەیە بەناوی گەلی کورد، تێکۆشانی سەربەخۆیی گەلی کورد وەك تێکۆشانی سەربەخۆیی کولتوور تێ دەگات، لایەنگری سەربەخۆیی سیاسی نییە، ئەوە لە بەرژوەندیی کوردیش نییە، تیرۆر ڕێی بەرژوەوەندی نییە، تیرۆری دژ بە تیرۆریش ڕێی بەرژوەندی نییە، کێشەکە بەو ڕێبازانە چارەسەر نابێت کە ئەمڕۆ دەوڵەتی تورك دەیانگرێتە بەر، گەورەترین هەڵە بریتییە لە داتاشین و خستنە ڕووی تێگەی مێژوویی "کورد بوونی نییە، ئەوانە تورکن"، ئەگەر دوای خۆشگوزەرانیی ئابووری مافە کولتوورییەکانیش بدرێت، دەکرێت بارودۆخەکە بگەیەندرێتە خاڵێکی نەرمتر، شتێکی ڕاست نییە ئەگەر گەلی کورد ئەو بزووتنەوانە بە هی خۆی بزانێت،**

ئەوانەی خوازیاری سەربەخۆیی کوردن، هەڵە دەکەن ڕێگەی چارەسەر بە پەسەندکردنی هەبوونی کورد و پەسەندکردنی راستیی مێژوویی و زانستیدا تێ دەپەڕێت."

مادەی سێیەم لە دەستووری خۆمان ڕوونی دەکاتەوە کە دەوڵەتی تورکیا و میللەتەکەی بارستەیەکی یەکگرتووە و لە دابەشکردن نایەت. لەبەر ئەم هۆیە جیاکردنەوەی رەگەزەکانی ناو میللەتی تورك و پێشاندانی بەشێك لە هاووڵاتیانی کۆماری تورکیا وەك گەل، یان میللەتێکی تر، شتێکی مەحاڵە. مادەی 142 لە یاسای سزای تورك ئەم جۆرە رەفتارانەی خستووەتە خانەی تاوانکردنەوە. بەپێی مادەی 142/3، هەرکەسێك بەهەر شێوەیەك بانگەشە بکات بۆ نەهێشتنی هەستە نەتەوەییەکان، یان لاوازکردنیان، سزا دەدرێت. لە وتاری ئاماژە بۆ کراودا هەوڵ دەدرێت هاووڵاتیانی کۆماری تورکیا، ئەوانەی لە رۆژهەڵاتی تورکیامان دەژین، وەك گەل-ێکی جیاواز و میللەتێکی جیاواز پێشان بدرێن. لەبەر ئەوە لێدوانی ئاماژە بۆ کراو مادەی 142/3ی یاسای سزای تورکی پێشێل کردووە.

لێدوانی دووەم کە بۆ وتارەکە وەرگیراوە، لێدوانی محەممەد عەلی ئایبارە. ئەم کەسە لە لێدوانی خۆیدا بانگەشەی ئەوەی کردووە راست نییە ناوی چەتە لە یاخیبووە جوداخوازەکانی ڕۆژهەڵات بنرێت و ئەوانە تێکۆشەرانی چەکدارن و بۆ دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ تێ دەکۆشن و لە دوای تورکی ئاخێوەران، کوردەکان گەورەترین گرووپی ئەتنیکین. وەك لە سەرەوە روونمان کردەوە، بەپێی مادەی 142/3 لە یاسای سزای تورك، پڕوپاگەندەی بەمەبەستی لە ناوبردن، یان لاوازکردنی هەستە میللییەکان حسێبی تاوانی بۆ دەکرێت. پێشاندانی بەشێك لە هاووڵاتیانی کۆماری تورکیا وەك میللەتێکی جیاواز لە میللەتی تورك دەکەوێتە خانەی پێشێلکردنی مادەی 142/3 لە یاسای سزای تورك. بۆیە لەو لێدوانەشدا هەمان رەگەزەکانی تاوانبارکردن دەبیندرێن.

لە لێدوانەکانی تری وتاری بابەتی لێکۆڵینەوەدا هیچ رەوشێك نەبیندرا کە پێچەوانەی ناوەڕۆکی مادەی 142/3 لە یاسای سزای تورك بێت.

پێویستە لێرەدا روونی بکەینەوە مادەی 142/3 لە یاسای سزای تورك سزای هەر بانگەشەیەك دەدات کە بۆ لە ناوبردن، یان لاوازکردنی هەستە میللییەکان بکرێت. بەم جۆرە پێشاندانی بەشێك لە میللەتی تورکی یەکگرتوو و لە دابەشکردن نەهاتوو وەك نەتەوە، یان گەل-ێکی تر دەکەوێتە چوارچێوەی ئەو مادەیەی یاساوە. بەڵام لە مادەی 142/3دا (پڕوپاگەندە) وەك رەگەزێك دانراوە، بەجۆرێك پێویستە بەجیا لێکۆڵینەوە بکرێت داخۆ پڕوپاگەندەکە بە بەمەبەست، یان بێ مەبەست کراوە. ئەرك و لێپرسراوێتیی دەستنیشانکردنی هەبوون و نەبوونی مەبەستێکی لەو جۆرەش ئەرك و لێپرسراوێتیی بەڕێزان سەرچاوە باڵاکانی دادوەرییە.

لەگەڵ نواندنی ڕێزدا.

1987/9/22

پسپۆر

پرۆفیسۆر د. کەیهان ئیچەل

***

جێگری داواكاری كۆماری له‌ دادگه‌ی ته‌ناهیی ده‌وڵه‌ت له‌ ئیستانبوڵ ڕۆژی 1987/9/25 ئه‌م نووسراوه‌ی نارد بۆ دادگه‌ی ته‌ناهی ده‌وڵه‌ت له‌ ئیستانبوڵ:

كۆماری توركیا

فه‌رمانگه‌ی داواكاری كۆماری له‌ دادگه‌ی ته‌ناهیی ده‌وڵه‌ت له‌ ئیستانبوڵ

ژماره‌: 342/1987 هـ. ز ژماره‌ی كۆد: 34410 1987/9/25

بۆ دادگه‌ی ته‌ناهیی ده‌وڵه‌ت له‌ ئیستانبوڵ

گۆڤاری به‌ناو "ئیكیبینه‌ دۆغرو" كه‌ گۆڤارێكی هه‌فتانه‌ی هه‌واڵ و شیكردنه‌وه‌یه‌ و له‌ ئیستانبوڵ ده‌رده‌چێت و فاتمه‌ یازجی سه‌رنووسه‌رێتی، له‌ وتارێكیدا به‌ ناوونیشانی "چاره‌سه‌ر بۆ پرسی كورد" كه‌ له‌ لاپه‌ڕه‌كانی 22 و 23 و 24ی ژماره‌ی 32 ی 9-1987/8/15دا بڵاو كراوه‌ته‌وه‌، هاتووه‌:

منه‌ی چاره‌سه‌ر ده‌كرێت بۆ بنه‌ڕه‌تترین كێشه‌ی توركیا، ئه‌و كێشه‌یه‌ "پرسی كورده‌"، سیاسه‌تی كۆنی چه‌ندین ساڵه‌ له‌ كار كه‌وتووه‌ و ئه‌وانه‌ی ئێستا وڵات به‌ڕێوه‌ ده‌به‌ن، یان ئاگره‌كه‌ خۆش ده‌كه‌ن و ده‌بنه‌ هۆكاری ئه‌وه‌ی كه‌ ئه‌م ئاگره‌ سه‌رانسه‌ری توركیا و پاشه‌ڕۆژی وڵات بگرێته‌وه‌، یان ئه‌وه‌تا ڕێگه‌یه‌كی دروست ده‌گیرێته‌ به‌ر و بۆ ئه‌وه‌ش "ئیكیبینه‌ دۆغرو" لێدوانی چه‌ند كه‌سایه‌تییه‌كی ناوداری سه‌باره‌ت به‌ چاره‌سه‌ركردنی كێشه‌كه‌ بڵاو كردووه‌ته‌وه‌.

له‌ به‌شێكدا لێدوانی عه‌زیز نه‌سین به‌ ناوونیشانی "پێویسته‌ مافه‌ كولتورییه‌كان بدرێن"، بڵاو كراوه‌ته‌وه‌، به‌ پێچه‌وانه‌ی ناوه‌ڕۆكی ماده‌ی 3 له‌ ده‌ستوور كه‌ ده‌ڵێت وڵاتی كۆماری توركیا و میلله‌ته‌كه‌ی بارسته‌یه‌كی یه‌كگرتووه‌ و له‌ دابه‌شكردن نایه‌ت، ئه‌م هاووڵاتیانی كۆماری توركیا له‌ هه‌رێمی ڕۆژهه‌ڵاتی وڵات وه‌ك گه‌ل و میلله‌تێكی جیاواز پێشان ده‌دات و شه‌ڕی ڕزگاریخوازی وه‌ك تێكۆشانی سه‌ربه‌خۆییی كلتوور وێنا ده‌كات و ڕای گه‌یاندووه‌ به‌رژوه‌ندی كوردیش له‌وه‌دایه‌ و گه‌یشتووه‌ به‌و ئه‌نجامه‌ی كه‌ ته‌نانه‌ت كۆماری توركیایش به‌ته‌واوی سه‌ربه‌خۆ نییه‌، بۆیه‌ دامه‌زراندنی هه‌رێمێكی سه‌ربه‌خۆ له‌ ڕۆژهه‌ڵات و مانه‌وه‌ی به‌ سه‌ربه‌خۆیی، كارێكی مه‌حاڵه‌.

به‌م جۆره‌ له‌ وتاره‌كه‌دا به‌ ئاشكرا به‌شێك له‌ هاووڵاتیانی كۆماری توركیا و پێكهێنه‌ری میلله‌تی تورك وه‌ك گه‌ل، یان نه‌ته‌وه‌یه‌كی جیاواز پێشان دراون و ئه‌م لێدوانه‌ی عه‌زیز نه‌سین بووه‌ به‌هۆی لاوازكردن و له‌ ناوبردنی هه‌سته‌ میللییه‌كان، بۆیه‌ ئه‌و ئه‌نجامه‌ ده‌ستگیر ده‌بێت كه‌ ئه‌م لێدوانه‌ پێچه‌وانه‌ی ماده‌ی 142/3ی یاسای سزای توركه‌.

سه‌ردێڕی "شه‌ڕی ڕزگاریی نه‌ته‌وه‌یی ده‌كه‌ین" كه‌ به‌شی دووه‌می وتاری "چاره‌سه‌ر بۆ پرسی كورد"ی گۆڤاره‌كه‌یه‌ و لێدوانی محه‌مه‌د عه‌لی ئایبار ناوێكی تێدا وه‌شێندراوه‌، به‌هۆی ئه‌وه‌ی "به‌شێك له‌ هاووڵاتیانی كۆماری توركیای به‌ جیاواز له‌ میلله‌تی تورك پێشان داوه‌"، ده‌كه‌وێته‌ خانه‌ی لاوازكردن و نه‌هێشتنی هه‌سته‌ میللییه‌كانه‌وه‌.

له‌ ڕاپۆرتی ڕۆژی 1987/9/22ی كه‌سی پسپۆریشدا كه‌ لێكۆڵینه‌وه‌ی سه‌باره‌ت به‌ ناوه‌ڕۆكی وتاری گۆڤاره‌كه‌ ئه‌نجام داوه‌، بابه‌ته‌كه‌ به‌ تێروته‌سه‌لی ڕوون كراوه‌ته‌وه‌.

**بەو پێیە لێدوانەکانی عەزیز نەسین و محەمەد عەلی ئایبار بۆ وتاری "چارەسەر بۆ پرسی کورد" لە وتاری بڵاوکراوە لە گۆڤاری "ئیکیبینە دۆغرو"دا دەکەونە خانەی پێشێلکردنی مادەی 142/3ی یاسای سزای تورکەوە و لەبەر ئەوە دەست کرا بە لێپرسینەوە لە خاوەنی لێدوانەکان.**

**بەپێی یاسای ژمارە 5680ی چاپەمەنیی هەموارکراو بە یاسای ژمارە 2950 بەناوی رای گشتییەوە داوا دەکرێت بڕیاری "کۆکردنەوە"ی گۆڤاری "ئیکیبینە دۆغرو"، ژمارە 32، 9-1987/8/15، بدرێت.**

**بولبان ئاکباش**

**یاریدەدەری داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبول**

★★★

ڕۆژی 1987/12/24 لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ لێپرسینەوەم لەگەڵدا کرا. ئەمەی لای خوارەوە کۆنووسی لێپرسینەوەکەیە:

تاوانبارکراو: محەمەد نوسرەت نەسین (عەزیز نەسین): کوڕی عەبدولعەزیز و حەنیفەیە، لە دایکبووی ساڵی 1915یە لە ئیستانبوڵ، لە گوندی گۆربەکی سەر بە گیرەسۆن تۆمار کراوە و لە وەقفی نەسین لە قەزای چاتالجە دادەنیشێت.

تاوانەکەی بۆ باس کرا و داوای لێ کرا بەرگری لە خۆی بکات:

گوتی: "هەموو بیر و بۆچوونەکانی ئەو بەشەی کە لە ژێر ناوی مندا لە وتاری 'چارەسەر بۆ کێشەی کورد: بڕیاری هەستیار'ی ژمارە 32ی گۆڤاری 'ئیکیبینە دۆغرو'دا بڵاوبوونەتەوە، بیر و بۆچوونی منن. بەڕێوەبەرانی ئەو گۆڤارە کاتێک بۆچوونی کەسانی جۆراوجۆریان سەبارەت بە کێشەی کورد وەرگرت، وەک بیرمەندێک پرسیاری بۆچوونی منیشیان کرد. سەیری بۆچوونەکانی خۆمم کرد لەو بارەیەوە و بۆچوونەکانم وەک خۆیان لە گۆڤارەکەدا بڵاو کراونەوتەوە. واتا ئەو بەشەی بە تاوان دادەنرێت، هی منە.

لەم نووسراوەدا، وەک ئەوەی بە ئاشکرا گوزارەی لێ کراوە، رام گەیاندووە دژی دەوڵەتێکی کوردیی جوداخوازم. من دەقی مادەی 3 لە دەستوور 'یەکگرتووی و لە دابەشکردن نەهاتوویی وڵاتی کۆماری تورکیا و میللەتەکەی' وەک رێسایەک بۆ رێگرتن لە دامەزراندنی دەوڵەتی جوداخواز تێ دەگەم و دەربڕینی ئەو بۆچوونانەم بەمەبەستی رێگرتن بووە لە کارێکی جوداخوانەی لەو جۆرە. بۆیە لە بیر و بۆچوونەکانمدا هیچ وشەیەک نییە بە ئاراستەی لە ناوبردنی هەستە میللییەکان. بە پێچەوانەوە، داوا دەکەم لە بەرامبەر داخوازییەکانی دامەزراندنی دەوڵەتی جوداخواز مافە کولتوورییەکانی گەلی کورد بدرێت و گوزارەم لەوە کردووە کە یەکیەتی و یەکبوون بەو جۆرە پێک دێت و پێم وایە تەنیا بەو جۆرە رێ لەو داخوازییانە دەگیرێت. دووبارەی دەکەمەوە هیچ رەگەزێکی تاوانبارکردن لە قسەکانمدا بەدی ناکرێت."

تاوانبارکراو روونی کردەوە هیچ شتێکی تری نییە بۆ گوتن و پاش ئەوەی گوتەکانی بۆ خوێندرایەوە، پێکەوە واژۆ خرایە ژێریان.

| یاریدەدەری داواکاری کۆماری | نووسەری تۆمار | تاوانبارکراو |
|---|---|---|
| | | محەمەد نوسرەت نەسین |
| | | (عەزیز نەسین) |

***

**فەرمانگەی داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ لە 1987/12/28 ئەم داواکارینامەیەی ڕێکخست:**

**کۆماری تورکیا**

**ئیستانبوڵ**

**فەرمانگەی داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ**

**ژمارە 34410**

**داواکارینامە**

**بۆ دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ**

**داواکار: ك. ه**

**تاوانبارکراوان:**

1) **محەمەد عەلی بایار: کوڕی تەحسین و عالیەیە، لە دایکبووی ساڵی 1926ە، لە بەیئۆغلۆی ئیستانبوڵ تۆمار کراوە و لە بەبەك ئیبتکار ئارالغی – ژمارە 14/4 دادەنیشێت.**
2) **محەمەد نوسرەت نەسین (عەزیز نەسین): کوڕی عەبدولعەزیز و حەنیفەیە، لە دایکبووی ساڵی 1915یە لە ئیستانبوڵ، لە گوندی گۆربەکی سەر بە گیرەسۆن تۆمار کراوە و لە وەقفی نەسین لە قەزای چاتالجە دادەنیشێت.**
3) **فاتمە یازجی: کچی محەمەد نیازی و عالیەیە، لە دایکبووی ساڵی 1955ە، لە گوندی شوباسی سەر بە قەزای کەمالیە تۆمار کراوە و لە شەقامی کاباکولاك – ژمارە 6/3، قەرەگومرك – ئیستانبوڵ دادەنیشێت.**

**لێپرسراوی گۆڤاری بەناو "ئیکیبینە دۆغرو"ە.**

**تاوان: لاوازکردن و لە ناوبردنی هەستە میللییەکان لە ڕێی وەشاندن و بڵاوکردنەوەوە.**

**مێژووی تاوان: 1987/8/9**

**نووسراوی لێپێچینەوەی سەرەتایی لەگەڵ ئەو تاوانبارکراوانەی کە لە سەرەوە ناسنامە و تاوانەکانیان نووسراوە، وەك هاوپێچ خراوەتە پاڵ ئەم نووسراوە.**

**لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە لە ژمارە 32ی 9-1987/8/15ی گۆڤاری هەواڵ و شیکردنەوەی بەناو "ئیکیبینە دۆغرو" کە یەکێك لە تاوانبارانی سەرەوە بەناوی فاتمە یازجی بەڕێوەبەری لێپرسراویەتی و لە ئیستانبوڵ دەردەچێت، لە وتارێکدا بەسەردێڕی "چارەسەر بۆ پرسی کورد: بڕیاری هەستیار" کە لە لاپەڕە 20وە دەست پێ دەکات و لە لاپەڕەی 25 کۆتایی دێت، وای بۆچووە پرسی کورد بنەڕەتترین کێشەی ڕۆژەڤی تورکیایە و دەستەواژەی "سیاسەتی کۆنی چەندین ساڵە لە کار کەوتووە و ئەوانەی ئێستا وڵات بەڕێوە دەبەن، یان ئاگرەکە خۆش دەکەن و دەبنە هۆکاری ئەوەی کە ئەم ئاگرە سەرانسەری تورکیا و پاشەڕۆژی وڵات بگرێتەوە، یان ئەوەتا**

ڕێگەیەکی دروست دەگیرێتە بەر"ی بەکار هێناوە و گۆڤارەکە ئەم کێشەیەی لەگەڵ هەندێك لە کەسایەتییە ناسراوەکاندا تاوتوێ کردووە و وەڵامەکانی ئەوانی لە بارەی چارەسەرکردنەوە بلاو کردووەتەوە.

لە بەشی "پێویستە مافە کولتوورییەکان بدرێن" کە لێدوانی عەزیز نەسینە و لە بیر و بۆچوونەکانی ناو نووسینەکەدا جێگەی کراوەتەوە، لێدوان لێ وەرگیراو بەپێویستی دەزانێت بە ئاشکرا بگوترێت لە تورکیا گەلێك هەیە بەناوی کورد، گەورەترین هەڵە بریتییە لە نکۆڵیکردن لە سەرتاپای ئەو گەلە، چەندین ساڵە بە یاسا نکۆڵی لە هەبوونی دەکرێت، مەسەلەکە وەك فەلسەفەی نکۆڵیکردنە لە تورکەکانی بولگارستان لەلایەن بولگارەکانەوە، بەو هۆیەشەوە نەتوانراوە هەڵوێستێکی ڕوون سەبارەت بە تورکەکانی بولگارستان بگیردرێتە بەر، هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە بە گەلێك بڵێت ڕەچەڵەکی تۆ ئەمە نییە و ئەوەیە، پێویستە تێکۆشانی سەربەخۆیی گەلی کورد وەك تێکۆشانی سەربەخۆیی کولتووری بگیردرێتە دەست، لەگەڵ سەربەخۆیی سیاسیدا نییە، کۆماری تورکیا خۆی تەواو سەربەخۆ نییە و کورد بەرژەوەندییان نابێت لە سەربەخۆییدا، پێویستە یاساکانی ئەمڕۆ هەموار بکرێن و هەبوونی گەلی کورد بەتەواوی پەسەند بکرێت و سەرجەم مافە کولتوورییەکانیان پێ بدرێت، بەدرێژایی ساڵان ڕایەکی گشتیی هەڵە ئافرێندراوە و حەزنەکردن لە کورد بەرهەم هێندراوە، ئەو هەڵە گەورەیە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە بەپێی تێگەیەکی مێژوویی دەستکرد گوتراوە کورد هەبوونی نییە و ئەوانە تورکن، نەتەوەپەرستیی هاوچەرخ بەوە نابێت بە مرۆڤ بگوترێت ڕەچەڵەکی تۆ ئەوەیە، مرۆڤێك خۆی سەر بە چ میللەتێك بزانێت سەر بەو میللەتەیە، تیرۆر ڕێگەی بەرژەوەندی نییە، تیرۆری دژ بە تیرۆریش ڕێگەی بەرژەوەندی نییە، ئەو ڕێگەیە ناگات بە سەربەخۆیی و چارەسەری و حکوومەتی هەنووکەیی لەبەر ئەوەی لە دەرەوەی بازنەی زانستە، نەیتوانیوە چارەسەر بۆ کێشەکە بدۆزێتەوە. لێدوان لێ وەرگیراو پاش ئەوەی ڕای دەگەیەنێت ئەو مەسەلەیە بەپێی داخوازیی هێزە ئیمپریالیستییەکان ڕێك خراوە، پێی وایە لایەنەکان پێویستە زۆر ژیرانە بیر بکەنەوە، تورکەکان و کوردەکانیش پێویستە زۆر ژیر بن، شەڕی ڕزگاریخوازی بە کوشتنی ژن و منداڵ نابێت، بۆیە چارەسەر لە پەسەندکردنی ئەو ڕاستییە مێژوویی و زانستییەدایە.

محەمەد نوسرەت نەسین (عەزیز نەسین) لە وتەکانیدا لای داواکاری کۆماریمان ددانی پێدا ناوە بیر و بۆچوونی ژێر بەشی "پێویستە مافە کولتوورییەکان بدرێن" هی ئەون و ڕوونی کردووەتەوە دژی دەوڵەتێکی جوداخوازی کوردییە، بنەمای "دەوڵەت و وڵات و میللەتی تورکیە بارستەیەکی لە دابەشکردن نەهاتووە"ی مادەی 3ی دەستوورمان وەك بنەمایەك بۆ ڕێگرتن لە دامەزراندنی دەوڵەتی جوداخواز تێ دەگات، بۆیە پێی وایە لە بیر و بۆچوونەکانیدا هیچ ڕەگەزێك نییە کە ببێت بەهۆی لاوازکردن، یان نەهێشتنی هەستە میللییەکان.

دەسەڵاتی مادەی 3 لە دەستوورمان "دەوڵەت و وڵات و میللەتی تورکیا بارستەیەکی لە دابەشکردن نەهاتووە. زمانەکەی تورکییە"، لە ئارادایە. لەوێدا لە پاڵ وڵاتدا لە دابەشکردن نەهاتوویی میللەتیش ڕوون کراوەتەوە. لەبەر ئەوە بەهیچ جۆرێك ناکرێت باس لە گەلانی پێکهێنەری میللەتی تورك بکرێت و بەشێك لە هاووڵاتیانی کۆماری تورکیا وەك گەلێکی تر پێشان بدرێت. ڕەفتاری لەو جۆرە خراوەتە بەر سزای مادەی 142/3 لە یاسای سزای تورك. دادگەی باڵای ژمارە 9 ڕۆژی 1976/10/5 لە بڕیاری 48/47دا ڕەفتاری لەو جۆرە بە: "پڕوپاگەندە بۆ دابەشکردنی نەتەوەی تورك بۆ گرووپی ئەتنیکی، ئەنجامدانی چالاکی بۆ پشتیوانیکردن لە پەروەردە و فێرکردن بە زمانی تری بەدەر لە زمانی تورکی، لە ناوبردن، یان لاوازکردنی هەستە میللییەکان" دادەنێت.

**بیر و بۆچوونەکانی محەمەد نوسرەت نەسین لە یەکگرتوویی وڵاتدا گەلێکی جیاوازی کورد و زمان و کولتوورێکی جیاواز دەخەنە روو و داوا دەکات ئەمە وەك راستییەکی مێژوویی پەسەند بکرێت و یاساکانیش بەو ئاراستەیەدا هەموار بکرێن. لێپێچینەوە و لێکۆڵینەوەکان گەیشتنە ئەنجامێك ئەو لێدوانانە بۆ سازدانی رای گشتی و هاوبەش پەیداکردن بڵاو کراونەتەوە و مادەی 142/3ی یاسای سزای تورکیان پێشێل کردووە.**

**(...)**

**بەو پێیە بەناوی رای گشتی و بەپشتبەستن بە مادەکانی یاسای ژمارە 2845 داوا دەکرێت تاوانبارکراوان دادگایی بکرێن و بڕیار بدرێت بەوەی:**

- **أ) محەمەد نوسرەت نەسینی تاوانبارکراو بەهۆی سەردێڕی "پێویستە مافە کولتوورییەکان بدرێن"، بە مادەی 142/3-6 لە یاسای سزای تورکی گونجاو لەگەڵ تاوانی تاوانبارکراو،**
- **ب) محەمەد عەلی ئایباری تاوانبارکراو بەهۆی سەردێڕی "شەڕی ڕزگاریی نەتەوەیی دەکەن، بە مادەی 6-142/3 لە یاسای سزای تورکی گونجاو لەگەڵ تاوانی تاوانبارکراو،**
- **ت) تاوانبارکراو فاتمە یازجیی لێپرسراو لە هەردوو وتارەکە بە مادەی 142/3-6 لە یاسای سزای تورك و مادەی 16/1 لە یاسای ژمارە 5680ی گونجاو لەگەڵ تاوانی تاوانبارکراو سزا بدرێت و ژمارەی 32ی گۆڤاری "ئیکیبینە دۆغرو" لە مێژووی 9-1987/8/15 کە وتارەکانی هۆکاری تاوانبارکردنی تێدا بڵاو کراونەتەوە، بەپێی مادەی 36 لە یاسای سزای تورك بڕیاری دەستبەسەرداگرتنی بۆ دەربکرێت.**

1987/12/28

**بولبان ئاکباش**

**یاریدەدەری داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبول**

★★★

**فەرمانگەی داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ ڕۆژی دواتر (1987/12/29) بەم نووسراوەی خوارەوە کردنەوەی دۆزی بە وەزارەتی داد ڕاگەیاند:**

**کۆماری تورکیا**

**فەرمانگەی داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت**

**ه. ز. ژمارە:** 342/1987 **کۆد:** 34410

**بۆ بەرچاوی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کاروباری سزا لە وەزارەتی داد**

**بۆ فەرمانگەی داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ**

**پەیوەندی: نووسراوی ژمارە 1987-43382ی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کاروباری سزا لە 1987/8/19**

**لە وتاری "چارەسەر بۆ پرسی کورد: بڕیاری هەستیار"دا لە لاپەڕەی 20 تا 25ی ژمارە 32ی 9-1987/8/15ی گۆڤاری هەواڵ و شیکردنەوەی بەناو "ئیکیبینە دۆغرو" کە لە ئیستانبوڵ دەردەچێت، باس لەوە کراوە گوایە پرسی کورد سەرەکیترین کێشەی ڕۆژهەڤی تورکیایە و تاوانبارکراوان فاتمە یازجی، محەمەد نوسرەت نەسین و محەممەد عەلی بایار بە لاوازکردن و لەناوبردنی هەستە میللییەکان لە ڕێی بڵاوکردنەوەوە تاوانبار کران و لە ئەنجامی لێپێچینەوەی سەرەتاییی ئەنجامدراو لەلایەن ئێمەوە لە مێژووی 1987/12/28 لەسەر بناغەی 1987/242 و داواکارینامەی ژمارە 1987/206 لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ دۆزی گشتی لە دژیان کرایەوە.**

**داواکارینامەی پەیوەندیدار خراوەتە ڕوو.**

**ئەگەر پێویست بکات، بەڵگەنامەکان بەڕێزەوە دەخرێنە ڕوو.**

1987/12/29

**بولبان ئاکباش**

**یاریدەدەری داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبول**

★★★

## بەرگرینامەکانی دۆزەکە

رۆژی 1988/6/30 لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ دادگایی کرام و ئەمەی خوارەوە دەقی بەرگرینامەکەمە:

بەرگرینامە

ئەمە بەرگرینامەی منە لەو دۆزەی سەبارەت بە پرسی کورد لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ لە دژم تۆمار کراوە.

سەرۆکی بەڕێز و دادوەرە بەڕێزەکان...
گۆڤاری بەناو "ئیکیبینە دۆغرو" لە ژمارەی ماوەی 9-1987/8/15دا ڕاپرسییەکی سەبارەت بە پرسی کورد ئەنجام دا. لەو نێوانەدا ئەو پرسیارە بە تەلەفۆن لە منیش کرا. منیش هەر بە تەلەفۆن ئەو وەڵامەم دایەوە کە لە گۆڤاری ئاماژە بۆ کراودا بڵاوکراوەتەوە. پێش ئەوەی بێمە سەر وەڵامەکەم، بەشێك لە پێشوتاری گۆڤارەکە دەخەمە ڕوو:
"بابەتەکە جدییە. گرنگترین کێشەی ڕۆژەڤی تورکیایە."
منیش باوەڕم وایە پرسی کورد جدیترین و گرنگترین کێشەی ڕۆژەڤی تورکیایە. بەوەشدا دیارە کێشەیەکی جدییە کاتێك دەستەی پایەبەرزی دادوەرانی ئەم دادگەی تەناهییەی دەوڵەت کە دادگەیەکی پسپۆڕی کۆماری تورکیایە، ئێمەمانان دادگایی دەکات.
سەرجەم دامەزراوەکانی دەوڵەت، سا لە هەر دەوڵەتێك بێت، گرنگترین دامودەزگای ئەو دەوڵەتەن. جدیترین پایەی ناو ئەو دامودەزگا هەرە جدییانە لە هەموو دەوڵەتان بێ هیچ گومانێك سەرۆکایەتییەکانی ئەرکانی گشتیی سوپا و سەرۆکەکانیانە. سەرۆکایەتیی گشتیی ئەرکانی سوپا و سەرۆك لە هەر دەوڵەتێکی جیهان دامودەزگا و کەسایەتیی هێندە جدین، کەسانی ئەو دامودەزگایانە بەهیچ جۆرێك پێ ناکەنن و لە ڕۆژنامەکاندا وێنەیەکی سەرانی گشتیی ئەرکانەکانی سوپا نەبیندراوە ڕوو بەخەندە گیرابێت.
پێش ئەوەی بچمە سەر بابەتەکە، دەخوازم ببینم و پێشانی ئێوەیشی بدەم دەزگای سەرۆکایەتیی گشتیی ئەرکانی سوپای تورکیا کە هاوشێوەی هەموو وڵاتێکی تر جدیترین دامەزراوەی دەوڵەتە، بە دەربەستییەکی چۆنەوە بۆ پرسی کوردی، جدیترین کێشەی ئەم ڕۆژگارەی تورکیا، دەڕوانێت.
سەرۆکایەتیی گشتیی ئەرکانی سوپای کۆماری تورکیا تا پێش کودەتای 1980/9/12یش ئەفسەرەکانی ئەرکانی سوپای ڕادەسپارد ئەو پرسە زۆر جدییەی کورد بۆ گەلەکەمان ڕوون بکەنەوە. ئەو ئەفسەرە بەڕێزانەی ئەرکانی سوپا پارێزگا بە پارێزگا دەگەڕان و چۆنایەتی و ڕاستی و ڕووی ناوەوەی پرسی کوردیان بۆ گەلی خۆمان ڕوون دەکردەوە. یەکێك لەوانە بەناوی یوزباشی ئۆغوز پێش ئەوەی لە بەرامبەر جەماوەر لە ئەرزەڕووم بە مایکرۆفۆن دەست بە قسەکردن بکات، هەمان بابەتی بۆ 120 هەزار هاووڵاتیی ترمان ڕوون کردبووەوە. ئەو قسانەشی لە خۆوە نەدەکرد. دوو کتێبی بڵاوکراوەی سەرۆکایەتیی گشتیی ئەرکانی سوپای بەدەستەوە بوو.

یەکێکیان کتێبی "مێژووی ڤارتۆ" و ئەویتریشیان "تورکەکانی نیشتەجێی دەوروبەری دەریاچەی وان و رووباری فورات" بوون. لە هەر یەکێك لەو کتێبانە سەدهەزار دانە چاپ کرابوون و لە بازاڕدا نەمابوون. بڕیار بوو سەرلەنوێ چاپ بکرێنەوە.

یوزباشی ئۆغوزی هێژا و راسپێردراوی سەرۆکایەتیی گشتیی ئەرکانی سوپای جدیترین دامەزراوەی کۆماری تورکیا لە بەرامبەر مایکرۆفۆن دەفاودەق ئەم قسانەی خوارەوەی سەبارەت کوردەکانی هۆکاری جدیترین کێشەی تورکیا بۆ ئاپۆڕەی ئامادەبووان دەگێڕایەوە: (چەند تیکەیەك لە قسەکانی وەردەگرم.)

"... برادەران، هەرگیز ناهێڵین گەمەمان پێ بکرێت. ئاگامان لە قسەکانمان دەبێت. بینیمان ئەو تیرەیەی کوردی پێ دەگوترێت، برای تورکەکانن. لە هەمان قۆڵن. بەڵام تا لە تواناماندا بێت و بۆ ئەوەی کارت نەدەینە دەستی دوژمنان، دەستەواژەی کورد بەکار ناهێنین. لە سەرجەم بڵاوکراوەکانی سەرۆکایەتیی گشتیی ئەرکانی سوپا و لە بەڵگەنامەکانی مێژووی شەڕدا هەمیشە وەك تورکمانی ڕۆژهەڵات ناویان براوە. (...) لە بەشە بەرزەکانی سەر شاخەکان و لووتکەکان بەفرێك هەبوو بە هاوین و زستان نەدەتوایەوە. کاتێك خۆر هەڵدەهات، توێژی سەرەوەی بە شەختەبوو و بریقەدار سەر بەفرەکانی دادەپۆشی. سەرەوەی رەق و ژێرەوەی نەرم دەبوو. کاتێك مرۆڤ بەسەر ئەو بەفرەدا دەڕۆیشت، ئەو شوێنەی پێی پێدا دەنا، رووددەنیشت و دەنگی 'کارت-کورت'ی دەردەکرد. لەم سۆنگەیەوەیە تورکمەنەکانی ڕۆژهەڵات بە کورد ناو دەبرێن. ئەوانەی جوداخوازان بە کورد ناویان دەبەن، راستییەکەی ناوی ئەو دەنگەیە کە لە کاتی رۆیشتنی تورکە نیشتەجێکانی کوێستانە بەرزەکان و هەرێمە بەفراوییەکاندا لە ژێر پێیان دەردەچێت." (سەرچاوە: ئیمپراتۆریای ئەیلوول، وەشانخانەی زانستیی ئەربیل توشالب، 1988، ل 264-265.)

سەرۆکی بەڕێز و ئەندامانی بەڕێزی دەستەی دادوەران! فەرموون من لەبەر ئەوەی ئەو تورکمانانەی لەسەر چیا بڵندەکان پێ بە بەفردا دەنێن و دەنگی "کارت-کورت" لە ژێر پێیان دەردەچێت، بە کورد ناویانم بردووە و وەك نەتەوە بەرگریم لە مافە کولتورییەکانیان کردووە، بە سیفەتی تاوانبارکراو لە بەردەم ئێوەدام و خۆم هیچ کاتێك ئەم رەوشەم پەسەند نەکردووە.

بێ ئەوەی پێویست بکات خۆم بخەمە دۆخێکەوە خاکیبوون بنوێنم، دەڵێم من هەرچەندە یەکێکم لە نووسەرانی چیرۆکی کۆمیدیی هاوچەرخ، کە نەك تەنیا لە تورکیا، بگرە لە سەرانسەری جیهانیش ناسراوم، ددانی پێدا دەنێم دەستەوستان دەبم لە دانانی کۆمیدیایەکی گەورەی وەك ئەوەی لە بڵاوکراوەکانی سەرۆکایەتیی گشتیی ئەرکانی سوپا و جدیترین دەزگای کۆماری تورکیادا هاتووە و قسەی ئەفسەرێکی یوزباشیی ئەرکانی سوپایە و بە سرووش وەرگرتن لە شوبهاندنی دەنگی "کارت-کورت" باس لە ئەگەری تورکبوونی کوردەکان دەکات.

سەرۆکی بەڕێز و ئەندامانی بەڕێزی دەستەی دادوەران! دیسان لە کاتی لێپرسینەوەمدا لەم دادگەیە گوتبووم ئەم دۆزەی من دۆزێکی سیاسییە. دۆزە سیاسییەکان بەپێی نیشانە سیاسییەکانی ئەو رۆژگارە بۆیان هەیە دەستیان پێ بکرێت، یان نەکرێت. بەوەشدا دیارە ئەم دۆزە بە ئاشکرا دۆزێکی سیاسییە کە راستەوخۆ لەلایەن فەرمانگەی داواکاری کۆماریی دادگەی تەناهیی دەوڵەتەوە کراوەتەوە، بەڵام وەزارەتی ناوخۆ لە نووسراوێکدا بۆ وەزارەتی داد وتارەکەی ئێمە بە "جالیبی دیقەت گۆرولوموش" واتا بە زمانی تورکیی خۆمان "دیقەت چەکیجی گۆرولوش –

به سەرنجڕاكێش بینراوە" دادەنێت، واتا پاش دەرچوونی هۆشیاركردنەوە لە وەزارەتی ناوخۆوە ئەوسا كاروباری دادگاییكردن دەستی پێ كردووە، وەزارەتی داد ئەو نووسینە "بە سەرنجڕاكێش بینراوە"ی كردووە بە هاوپێچی نووسراوی خۆی و ناردوویەتی بۆ فەرمانگەی داواكاری كۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ و فەرموودەی پێدانی زانیاریی زۆر بەپەلەی خستووەتە سەری.

دادوەرانی بەڕێز! ئێمە زۆر باش دەزانین لە فەرمانگەی داواكاری كۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ لە كون و قوژبنی نووسینەكانمان دەكۆڵدرێتەوە. هەر سێ ڕۆژ لەمەوبەر لەسەر نووسینێكم كە بەو شێوەیە لێی كۆڵدرابووەوە، لەلایەن بەڕێز یەشار گونایدنەوە كە یەكێكە لە داواكارانی كۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ، راكێشرام بۆ لێپرسینەوە. مەبەستم ئەوەیە بڵێم داواكارانی كۆماری لە دادگەكانی تەناهیی دەوڵەت بێ هیچ گومانێك وەك ئەركی سەرشانیان نووسینەكانی ئێمەیان، وەك نووسینی بابەتی ئەم دۆزە خوێندووەتەوە و و لێیان كۆڵیونەتەوە و لەبەر ئەوەی هیچ تاوانێكیان تێدا نەدۆزیتەوە، بەدواداچوونیان بۆیان نەكردووە.

تەنانەت بەخەیاڵیش بیر ناچێت بۆ ونبوونی نووسینەكانم لەبەر چاوان، یان بۆ خەمساردیی داواكارانی كۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ. لە كاتێكدا رەوش بەم جۆرەیە، سەرەتا بە فەرمانی نێردراو لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ وەزارەتی داد و پاشان بە فەرمانی نێردراو لە وەزارەتی دادەوە بۆ فەرمانگەی داواكاری كۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ ئەم دۆزە كراوەتەوە و ئێمەش كەوتووینەتە دۆخی تاوانباركراوانەوە. راستییەكەی، ناردنی نووسراو لەم بارەیەوە لە وەزارەتی ناوخۆوە بۆ وەزارەتی داد و لەمیشەوە بۆ فەرمانگەی داواكاری كۆماری دەشێت حسێبی پرۆسەی دادوەریی ئاسایی بۆ بكرێت. بەڵام ئەگەر مۆڵەتم پێ بدەن بۆچوونی تایبەتی خۆم بهێنمە زمان، ناتوانم بڕوا بكەم سەرجەم ئەو رێوشوێنانە دەبنە رێوشوێنی ئاساییی دادوەری، چونكە لە توركیا رێكخراوێك هەیە سەری لە لمدا شاردووەتەوە و لە كاتێكدا جەستەی زەبەلاحی لەبەر چاوانە، هەوڵ دەدات وەك شترمورغ خۆی بشارێتەوە و گوایە هەموو كارێكی نهێنیی خۆی لە پشت پەردەی وەزارەتی ناوخۆوە دەشارێتەوە و دەكۆشێت لە رێی ئەو وەزارەتەوە جێبەجێی بكات و ئیدی ئێوەش و هەمووومان و سەرجەم نەتەوەی تورك دەزانین ئەو رێكخراوە دەزگای هەواڵگریی میللییە و كورتەی ناوەكەی "میت"ە، باوەڕم وایە ئەم دەزگایە داوای كردووە دۆز لە دژی ئێمە بكرێتەوە و —تەنانەت هەر ئەویش ئەو فەرمانەی داوە-. وەك هەموو جارێكیش خۆی لە پشت وەزارەتی ناوخۆوە حەشار داوە و هەر بەراستیش پێی وایە خۆی شاردووەتەوە. دیارە لە رەوشێكدا نیم بتوانم ئەم بۆچوونەم بسەلمێنم. بەڵام هۆكاری باوەڕ پێكراوم هەیە بۆ ئەوەی بڕوا بكەم لە مانگەكانی رابردوودا بە هەوڵی ئەو رێكخراوە كە رووی ناوەوەی بە هەموو قرێژی و گەماریی خۆیەوە كەوتووەتە روو، دراومەتە دادگە. دەبێت ئەوەش بڵێم ئەگەر بەڕاستی لەم گومانانەمدا لەسەر هەق بم، مۆڵەت بە خۆم دەدەم بڵێم دەزگای هەواڵگریی میللی دەستی وەرداوەتە سەربەخۆییی دادوەرانەی ئەم دۆزە. لەو سۆنگەیەوە، دادوەرانی بەڕێز، بەناوی دادوەریی سەربەخۆوە تكاتان لێ دەكەم ئەوەندەی لە توانادا هەیە دەست بكرێت بە لێكۆڵینەوە لەوەی داخۆ دەزگای هەواڵگریی میللی، بەڕاستی، تا چ رادەیەك دەستی لەم دۆزەدا هەیە، یان نییە.

دادوەران و داواکارانی کۆماریی دادگەی تەناهیی دەوڵەت کە وەك دادگەیەکی پسپۆڕ هاتووەتە دامەزراندن، لێکۆڵینەوە لە وتاری هۆکاری کردنەوەی ئەم دۆزە دەکەوێتە کرۆکی ئەرکەکانی ئەوانەوە، کەچی بێ ئەوەی پێویست بکات و هیچ سوودێکی هەبێت، داواکاری کۆماری بەمەبەستی لێکۆڵینەوە داویەتی بە کەسێکی پسپۆڕ و بەم کارەش وا دێتە پێش چاوم بۆ ئەوەی کێشەکەی من بدرێتە کەسێکی تر، بابەتەکە وەك تۆپی ئاگرین لەم دەستەوە بۆ ئەو دەست فڕێ دراوە.

کەسی پسپۆڕیش لە کۆتاییی راپۆرتی پڕ لە هەڵەی زانستیی خۆیدا دەنووسێت "ئەرك و لێپرسراویی دەستنیشانکردنی هەبوون و نەبوونی پڕوپاگەندەی بەمەبەست، یان بێ مەبەست ئەرك و لێپرسراویی بەرێزان سەرچاوە باڵاکانی دادوەرییە" و ئەم تۆپە گڕدارەی بۆ دادگەی ئێوە هاویشتووە. واتا داواکاری کۆماری و کەسی پسپۆڕ راستەوخۆ لێپرسراویەتی بابەتێك ناگرنە ئەستۆ، هەرچەندە دەکەوێتە خانەی ئەرك و شارەزاییی خۆیانەوە.

لە یەکەم لێپرسینەوەمدا لە دادگەکەتان هۆشیاریی ئەوەم دا ئەم دۆزە بۆ من نا، بگرە بۆ سیاسەتی گشتیی هەنووکەییی حکوومەت و دەوڵەت بەگشتی نەکردنەوەی باشترە یان راستە، چونکە لە مێژە دەزانرێت حکوومەتەکان ترسی ئەوەیان نییە هەندێك لە راستییەکان بە داپۆشراوی لە ناو چوارچێوەیەکی تەسکی رۆشنبیراندا بمێننەوە، بەڵام ناخوازن رای گشتی هەمان ئەو ڕاستییانە بزانن. خۆیان لەوە دوورەپەرێز دەگرن. بۆ نموونە، کتێبی "کۆنووسە نهێنییەکانی ئەنجوومەنی گەورەی میللەتی تورك" کە لە چوار بەرگ پێك دێت و بانکی کار "ئیش بانکاسی" سێ جار چاپی کردووە، تیایدا قسەکانی ئەتاتورك سەبارەت بە کورد سانسۆر نەکراون. بەڵام یەکێك لە گۆڤارەکان لەبەر ئەوەی هەمان ئەو قسانەی لەسەر لاپەڕەکانی خۆی بڵاو کردووەتەوە، لە بازاڕ کۆ کراوەتەوە، چونکە تەنیا چەند هەزار رۆشنبیرێکی بژاردە کە بەشی زۆریان دەستەمۆ کراون، دەتوانن لە "کۆنووسە نهێنییەکانی ئەنجوومەنی گەورەی میللەتی تورك"دا وتەکانی ئەتاتورك بخوێننەوە، بەڵام پاش وەشاندنی ئەو وتانە لە گۆڤارێکدا، لەلایەن هەزاران کەسەوە خوێندراونەتەوە.

ئەگەر ئەم دۆزە سیاسییەی دژ بە ئێمەش نەکراباوە، بۆچوونەکانی ئێمە سەبارەت بە پرسی کورد لە گۆڤاری "ئیکیبینە دۆغرو"دا لەلایەن چەند هەزار کەسێکەوە دەخوێندرانەوە و پاش ماوەیەك لە بیر دەکران. بەڵام ئێستا لەبەر ئەوەی دۆز کراوەتەوە، ئەو هەواڵانەی لە ساڵێك لەمەوبەرەوە لە رۆژنامەکاندا بڵاو کراونەتەوە و ئەو بیر و بۆچوون و بەڵگەنامانەی کە لێرە لە میانەی لێپرسینەوە و بەرگریکردن لە خۆماندا زۆر بە بەرفراوانی دەیانخەینە روو، وەك چۆن لە چاپەمەنیدا بڵاو دەکرێنەوە، بەهەمان شێوە دەیانکەین بە کتێب و چاپیان دەکەین. تاقیکردنەوەکانیش پێشانیان داوە قەدەخەی سەر چاپکردنی دەقی بەرگرینامەکانمان بێکەڵکە و بەرگرینامەکانی ناو کتێبێك کە بە شێوەیەکی ئاسایی دەهەزار دانەی لێ چاپ دەکرێت، لە تورکیا و دەرەوەی وڵات بە رێگەی کۆپێکردن ملیۆنان دانەی لێ بڵاو دەکرێتەوە.

ئێمە ناچارین لێرە بە شێوەیەکی بەرفراوان بەرگری لە خۆمان بکەین، چونکە ئەو سزایەی بۆ ئێمە داوا کراوە، سزایەکی قورسە. داوا دەکرێت پازدە ساڵی رەبەق زیندانی بکرێین. وەك ئەوەی لە یاسای فیزیادا هەیە، بڕی کاردانەوە یەکسانە بە بڕی کارلێکردن. نە گوڵاومان بەسەردا دەکەن و نە گوڵمان تێ دەگرن. بەپێی ئەوەی داوای پازدە ساڵ زیندانیکردنمان دەکرێت، بۆ ئەوەی خۆمان بپارێزین، ناچارین جۆرە لێدوانێك لەسەر کێشەی کورد بدەین کە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ سیاسەتی حکوومەت و بەگشتی لەگەڵ سیاسەتی حکوومەتەکانی تورکیادا یەك

ناگرنەوە. من شانازی دەکەم بەمەوە، چونکە ئەو راستییە زانستییانەی چەندین ساڵە توانای گوتن و ئاشکراکردنیان لە ئارادا نییە، پێم وایە جاری یەکەمە لە دادگەیەکدا ئاشکرا دەکرێن.

سەرۆکی بەڕێز، بەڕێزان ئەندامانی دەستەی دادوەری! من بەچی تاوانبار دەکرێم؟ لەبەر ئەوەی ناتوانین بزانین کەسە شارەواکان کێن، دوو کەسی بیندراو هەن من تاوانبار دەکەن. یەکێك لەوانە پرۆفیسۆر د. کەیهان ئیچەلی مامۆستای یاسای سزا لە کۆلێجی ماف و جێگری سەرۆکی زانکۆی ئیستانبوڵ و پسپۆری ئەم دۆزەیە. زانکۆی ئیستانبوڵ یەکێکە لە زانکۆکانی ئەنجوومەنی خوێندنی باڵا، بەڵام تەواوی زانکۆکانی دنیای هاوچەرخ حسێبی دەرچووی زانکۆ بۆ قوتابیانی دەرچووی ئەم زانکۆیە ناکەن. ئەویتریشیان بولبان ئاکباشی یاریدەدەری داواکاری کۆمارییە لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبول کە بێ ئەوەی هیچ پێویست بکات، داوای هاوکاریی لەو کەسە پسپۆڕە کردووە.

کەسی پسپۆڕ نەك لەبەر ئەوەی لە راپۆرتی خۆیدا منی تاوانبار کردووە، بگرە ئەگەر بەهەمان نالۆجیکییەوە منی بێتاوانیش دەربخستبایە، بۆچوونم لەبارەیەوە هەر نەدەگۆڕدرا. رووبەڕووی کەسێکی پسپۆڕ نا، کەسێکی نەزان بووینەتەوە. لەبەر ئەوەی نەزانیی کەسی پسپۆڕ لەو بوارەدا هێندە روون و ئاشکرایە، من دەمەوێت لەو تاوانبارکردنەی داواکارینامەوە دەست پێ بکەم کە بەڕێز داواکاری کۆماری بە پشتبەستن بە راپۆرتی کەسی پسپۆڕ ئامادەی کردووە. پێش ئەوەی وەڵامی دانە بە دانەی بانگەشەکانی بەڕێز داواکاری کۆماری بدەمەوە، دەمەوێت لەسەر ئەو مادەیە رابوەستم کە منی پێ تاوانبار کردووە. لە داواکارینامەدا وا گوتراوە:

"دژی دەوڵەتێکی جوداخوازی کوردییە، بنەمای ''دەوڵەت و وڵات و میللەتی تورکیە بارستەیەکی لە دابەشکردن نەهاتووە''ی مادەی 3ی دەستوورمان وەك بنەمایەك بۆ رێگرتن لە دامەزراندنی دەوڵەتی جوداخواز تێ دەگات، بۆیە پێی وایە لە بیر و بۆچوونەکانیدا هیچ رەگەزێك نییە کە ببێت بەهۆی لاوازکردن، یان نەهێشتنی هەستە میللییەکان.

دەسەڵاتی مادەی 3 لە دەستوورمان ''دەوڵەت و وڵات و میللەتی تورکیا بارستەیەکی لە دابەشکردن نەهاتووە. زمانەکەی تورکییە''، لە ئارادایە. لەوێدا لە پاڵ وڵاتدا لە دابەشکردن نەهاتوویی میللەتیش روون کراوەتەوە. لەبەر ئەوە بەهیچ جۆرێك ناکرێت باس لە گەلانی پێکهێنەری میللەتی تورك بکرێت و بەشێك لە هاووڵاتیانی کۆماری تورکیا وەك گەلێکی تر پێشان بدرێت. رەفتاری لەو جۆرە خراوەتە بەر سزای مادەی 142/3 لە یاسای سزای تورك. دادگەی باڵای ژمارە 9 ڕۆژی 1976/10/5 لە بڕیاری 48/47دا رەفتاری لەو جۆرە بە: ''پڕوپاگەندە بۆ دابەشکردنی نەتەوەی تورك بۆ گرووپی ئەتنیکی، ئەنجامدانی چالاکی بۆ پشتیوانیکردن لە پەروەردە و فێرکردن بە زمانی تری بەدەر لە زمانی تورکی، لە ناوبردن، یان لاوازکردنی هەستە میللییەکان'' دادەنێت."

دواتر درێژە بە داواکارینامەی بەڕێز داواکاری کۆماری دەدەم، بەڵام بە پێویستم زانی لێرەدا روونکردنەوەیەك بدەم. داواکاری کۆماری بەمەبەستی سزادانی من دەڵێت "ئەنجامدانی چالاکی بۆ پشتیوانیکردن لە پەروەردە و فێرکردن بە زمانی تری بەدەر لە زمانی تورکی، بە پڕوپاگەندە بۆ لە ناوبردن، یان لاوازکردنی هەستە میللییەکان دادەنرێت" و دەیەوێت لە پای ئەوە من سزا بدرێم. دەبێت راشکاوانە بڵێم زۆر سەرم سڕما. تکایە با بەڕێز داواکاری کۆماری لێم نەگرێت من ئەم پرسیارە دەکەم:

ئایا لە وڵاتێکی زۆر دوور لە تورکیا ژیاون و زۆر نییە هاتوونەتە تورکیا؟

واته له توركیا پەروەردە و فێركردن بە زمانی تری دەرەوەی زمانی فەرمی (واتە زمانی تری دەرەوەی زمانی توركی) قەدەغەیە و ئەگەر ئەم قەدەغەیە پێشێل بكرێت، هەستە نەتەوەییەكان لە ناو دەچن! ئەگەر وا بێت، دەبێت بڵێم لە چ رەوشێكی ترسناكداین... چونكە لە توركیا هەستە نەتەوەییەكان لاواز بوون، یاخۆ لە رەگەوە لە ناوچوون. ئایا بەڕێز داواكاری كۆماری نازانێت، بۆ نموونە، لە ئامادەییی كوڕان لە ئیستانبوڵ زمانی ئەڵمانی، لە ئامادەییەكانی ئەڵمانیا و نەمسا دیسان زمانی ئەڵمانی، لە ئامادەییەكانی Notre Dame و Saint Benoit و St. Miche و Saint Joseph زمانی فەرەنسی، لە كۆلێجی رۆبێرت و سەرجەم ئامادەییەكانی وەزارەتی پەروەردە لە ئەنادۆڵ زمانی ئینگلیزی و لە ئامادەییی ئیتاڵی زمانی ئیتاڵی دەخوێندرێت و منداڵانی خێزانە خواپێداوەكان لە پێشبڕكێدان –وا دیارە بۆ لە ناوبردنی هەستە نەتەوەییەكان- بۆ وەرگرتن لەو قوتابخانانە كە خوێندن تیایاندا بە پارەیە؟ ئایا قەت بەرگوێی كەوتووە لە زانكۆی بۆغازیچی و ئۆرتادۆغو تەكنیك و زانكۆی بیلكەنت كە لەبەر گرانیی خوێندن تیایدا تەنیا منداڵانی گەورە دەوڵەمەندان دەتوانن تیایدا بخوێنن، سەرلەبەری پەروەردە و فێركردن بە زمانی بیانییە؟ دەمەوێت لەم بارەیەوە مزگێنییەكی تر بدەمە بەڕێزیان. دەست كراوە بە ئامادەكاری بۆ پەروەردە و فێركردن بە زمانی ئەڵمانی لە زانكۆی ئەڵمانی، بە زمانی عەرەبی لە زانكۆی عەرەبی، بە زمانی فەرەنسی لە زانكۆی فەرەنسی و بە زمانی ئینگلیزی لە زانكۆی ئەمریكایی و بڕیار وایە ئەم زانكۆیانە بەم نێزیكانە بكرێنەوە. ئەگەر لە ناو پەروەردە و فێركردن بەو هەموو زمانەدا تەنیا زمانی كوردی ببێتە هۆی لاوازبوون، یان كوشتنی هەستە نەتەوەییەكان، پێویستە بۆ رزگاركردنی كۆمەڵ لەو دووفاقییە ئەو یاسایە بگۆڕین و رای بگەیەنین تەنیا پەروەردە و فێركردن بە زمانی كوردی هەستە نەتەوەییەكان لە ناو دەبات.

نازانم منداڵەكانی بەڕێز پرۆفیسۆری پسپۆڕ و بەڕێز داواكاری كۆماری و دادوەرانی بەڕێز دەچن بۆ چ قوتابخانەیەك لەو قوتابخانانەی كە بە زمانی بیانی پەروەردە و فێركردنیان تێدا بەڕێوە دەبرێت، بەڵام 2 منداڵ لە كۆی 25 منداڵی وەقفی نەسین كە خۆم دامەزرێنەریم، ئەمساڵ دەچنە زانكۆ و بە زمانی ئینگلیزی دەخوێنن.

بەڕێز داواكاری كۆماری مادەی 3ی دەستوور وەك بیانوو بۆ سزادانی من پێشان دەدات. ئەو مادەیە بەم جۆرەیە:

"دەوڵەت و وڵات و میللەتی توركیا بارستەیەكی لە دابەشكردن نەهاتووە. زمانەكەی توركییە..."

بەڵێ، راستە. رێك وەك ئەوەی لە دەقی مادەی 3ی دەستووردا هاتووە، "زمانەكەی توركییە." ئەگەر پلەی توركیزانیمان لە ئاستی قۆناغی خوێندنی ناوەندیشدا بێت، پێویستە لێرەدا پرسیاری ئەم بابەتە بكەین. زمانەكەی توركییە. زمانی كێ توركییە؟ لە یاسادا راشكاوانە نووسراوە: زمانی دەوڵەتی تورك توركییە. ئاشكرایە وایە. من پێچەوانەی ئەمەم نەگوتووە. زمانی دەوڵەت واتای زمانی فەرمی دەگەیەنێت. خەیاڵ ناچێت بۆ ئەوەی دەوڵەت زمانێكی تری هەبێت. "زمانەكەی توركییە" بەواتای "زمانی فەرمی توركییە" دێت. لە بڕیاری ژمارە 48/47ی فەرمانگەی ژمارە 9ی دادگەی باڵاشدا كە لە 1976/10/5 دەرچووە و داواكاری كۆماریش وەك سەرچاوە پێشانی داوە، نووسراوە "زمانی فەرمی توركییە" و بەمەشدا دیارە مەبەست لە زمانی دەوڵەتە. ئەگەر بەكارهێنانی دەستەواژەی "زمانی فەرمی" پێویست نەبوایە، فەرمانگەی ژمارە 9ی دادگەی باڵا لەم بڕیارەدا لەبری "زمانی فەرمی"، "زمانی توركی"ی دەنووسی.

ناكرێت بیر لە زمانێكی تری دەرەوەی زمانی فەرمی بكرێتەوە بۆ دەوڵەت، چونكە لەبەر ئەوەی دەوڵەت كەسێكی بەرجەستە نییە، زمانیشی نابێت.

بە کوردی نووسین و خوێندنەوە و قسەکردنی کوردەکانی تورکیا هیچ کاتێك نابێت بە تەگەرە لەبەردەم زمانی فەرمییاندا کە زمانی تورکییە. لەبەر ئەوەی ناچارم لێرەدا ڕوونکردنەوە بدەم، داوای لێبووردن لە دادوەرانی بەڕێز دەکەم، ئەوەی بە زمانی فەرمی ناودەبرێت، مەرج نییە زمانی نووسین و ئاخاوتن بێت. زمانی فەرمی واتای ئەو زمانە دەگەیەنێت کە لە پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەت و کاروبارەکانی دەوڵەتدا، بۆ نموونە، لە نووسراو، سەردان، دادگاییکردن، لێپرسینەوە و کاروبارە فەرمییەکانی تردا بەکار دەهێندرێت و لەو ڕۆژەشەوە کە لە قارەمانماراش زمانی تورکی وەك زمانی فەرمی ڕاگەیەندراوە، هەمیشە بەو سیستەمە کار کراوە و دەکرێت. بۆ نموونە، لە فەرەنسا نەتەوەی جیاواز هەن، بەڵام زمانی فەرمیی هەموویان فەرەنسییە. ئەم ڕەوشە لە ئەڵمانیا و سویسرا و یوگسلافیا و فینلەنداش بە هەمان جۆرە.

من لە کاتێکدا دەڵێم پێویستە ددان بە هەموو مافە کولتوورییەکانی گەلی کوردا بنرێت، کوردەکان بتوانن بە زمانی کوردی بخوێنن، بە زمانی کوردی کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤار و هەموو جۆرە بڵاوکراوەیەکی تریان هەبێت، هیچ کاتێك و لە هیچ شوێنێك نەمگوتووە با تورکی زمانی فەرمی نەبێت.

زۆر خەمگینم لە پای ئەوەی بە گێڕانەوەی کۆمەڵێك ڕاستی کە باوەڕم وایە زۆر باش و ڕەوان دەیانزانن، کاتی بەنرختان دەگرم. زۆر باش لە ڕەوشەکە تێ دەگەم؛ بەڕێز داواکاری کۆماری کاتێك ناچار بوو لەسەر داخوازی "میت"ی خۆحەشارداو لە پشت وەزارەتی ناوخۆوە ئەم دۆزە بکاتەوە، بیانووی پتەوی نەدۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ڕەوا سزا بدرێم، بۆیە ناچار کراوە ئەو بیانووانەم بۆ بئافرێنێت کە پێچەوانەی ڕاستین.

بەردەوام دەبم لەسەر خستنەڕووی داواکارینامەی بەڕێز داواکاری کۆماری:

"بیر و بۆچوونەکانی محەمەد نوسرەت نەسین لە یەکگرتوویی وڵاتدا گەلێکی جیاوازی کورد و زمان و کولتوورێکی جیاواز دەخەنە ڕوو و داوا دەکات ئەمە وەك ڕاستییەکی مێژوویی پەسەند بکرێت و یاساکانیش بەو ئاراستەیەدا هەموار بکرێن. لێپێچینەوە و لێکۆڵینەوەکان گەیشتنە ئەنجامێك ئەو لێدوانانە بۆ سازدانی ڕای گشتی و هاوبەش پەیداکردن بڵاو کراونەتەوە و مادەی 142/3ی یاسای سزای تورکیان پێشێل کردووە."

بەڕاستی بانگەشەیەکی زۆر لە لۆجیك بەدەرە، چونکە من ڕێك ئەوە دەکەم کە بەڕێز داواکاری کۆماری گوتوویەتی و لەبەر ئەوەش بێتاوانم. واتا دەڵێم هەبوونی کورد لە تورکیا ڕاستییەکی زانستییە و هەوڵ دەدەم ڕای گشتی ڕابهێنم بۆ پەسەندکردنی ئەو ڕاستییە و بۆ گۆڕینی بۆچوونی هەڵە و نازانستی مرۆگەل و دەمەوێت کارێکی وا بکەم یاسای نەگونجاو لەگەڵ ئەو ڕاستییە زانستییەدا بە ڕێگەی یاسایی بگۆڕدرێت. ئەمە سرووشتیترین مافی منە وەك هاووڵاتی، بەتەنیا مافیش نییە، بگرە وەك ڕۆشنبیر ئەرکی سەرشانیشمە. نە کەسی پسپۆر، نە داواکاری کۆماری، نە "میت"ی خۆمەڵاسداو لە پشت وەزارەتی ناوخۆوە و نە دادگە ناتوانن ئەم ماف و ئەرکەم لە دەست دەربهێنن. جگە لە مادە لە گۆڕین نەهاتووەکانی دەستوور، دەکرێت دەستوور و هەموو یاساکانی تریش بگۆڕدرێن و داواکردنی ئەو گۆڕینەش سرووشتیترین مافی هاووڵاتیبوونە. من بۆ داواکردنی ئەو مافەم و بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکەم هاووڵاتیم. خۆ ئەوە ئەمرۆ نەدۆزراوەتەوە کە جگە لە سازدانی ڕای گشتی هیچ ڕێگەیەکی تر نییە بۆ گرتنەبەری ڕێبازی یاسایی بەمەبەستی گۆڕینی یاسای پێچەوانەی ڕاستیی زانستی. من ئێستا لێرە لە هەوڵدام بۆ ئەوەی کارێکی وا بکەم کە داواکاری کۆماری، دادوەران، وەزارەتی ناوخۆ و "میت"ی خۆحەشارداو لە پشتی، گوێگرانی هۆڵی دادگە و خوێنەران، واتا هەموو ڕای گشتیی تورکیا باوەڕ بە ڕاستیی مێژوویی پرسی کورد بهێنن. ئەوەش ناوی دیموکراسییە. داواکاری کۆماری کە هەوڵی من بۆ سازدانی ڕای گشتی

بەمەبەستی گۆڕینی یاساکان بە گرتنەبەری ڕێبازی یاسایی بە تاوان دەزانێت، مەگەر شارەزای شێوازێکی تری دیموکراسییە کە تا ئێستا جیهان پەی پێ نەبردووە؟

با مادەی 142/3ی یاسای سزای تورك کەی داواکاری کۆماری دەیەوێت منی پێ سزا بدات، پێکەوە بخوێنینەوە:
"هەرکەسێك بەهەر شێوەیەك پڕوپاگەندە بکات بۆ بەکارهێنانی تێبینیی ئەتنیکی بەمەبەستی هەلگرتنی بەشێك، یان سەرجەم ئەو مافە گشتییانەی کە لە دەستووردا ناسێندراون، یاخۆ بەهەر شێوازێك پڕوپاگەندە بکات بۆ لاوازکردن، یان کوشتنی هەستە میللییەکان، بە پێنج تا دە ساڵ سزای قورسی زیندانیکردن سزا دەدرێت."

بەڕێزان دادوەر و داواکاری کۆماری، بە پیشە مافناسن. مافی ناو ئەم مادەیە بەهیچ جۆرێك بەو واتایە نایەت وەك ئەوەی داواکاری کۆماری لێکی داوەتەوە و هەوڵدانی من بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە تا ئەوپەڕی سنوور خەمگینم دەکات. ئەگەر گۆڕینی یاساکان بە گرتنبەری ڕێبازی یاسایی و پڕوپاگەندەکردن و سازدانی ڕای گشتی بۆی بە یاسا قەدەخە بوایە، بنەما دانراوەکانی جیهان لە یاساکانی حەمووڕابییەوە تا ئەمڕۆ هیچ گۆڕانێکیان تێدا نەدەکرا. ئەوە چ تێگەیشتنێکە لە ماف و لە دەستوور! تکایە بمبوورن، پێم وایە بەڕێز داواکاری کۆماری و کەسی پسپۆڕ هەست دەکەن ناچارن کارێکی وا بکەن هەر چۆنێك بووە من سزا بدرێم. بەڵگەشم ئەوەیە چالاکییەکەی من لە ڕووی ماف و لۆجیك و زمانەوە نە لە دوور و نە لە نێزیکەوە هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ هیچ ڕەگەزێکی مادەی 142/3 لە یاسای سزای تورکدا نییە.

ڕەگەزی یەکەم: بەکارهێنانی تێبینیی ئەتنیکی بەمەبەستی هەلگرتنی بەشێك، یان سەرجەم ئەو مافە گشتییانەی کە لە دەستووردا ناسێندراون.

ڕەگەزی دووەم: پڕوپاگەندەکردن بۆ لاوازکردن، یان کوشتنی هەستە میللییەکان.

هەوڵدان بۆ سازدانی ڕای گشتی بەمەبەستی گۆڕینی یاسایەك بە گرتنبەری ڕێبازی یاسایی دیموکراسی خۆیەتی و هەرگیز بۆ نەهێشتن، یان لاوازکردنی هەستە میللییەکان نییە.

سەرۆکی بەڕێز، بەڕێزان ئەندامانی دەستەی دادوەری! لەم ڕۆژگارەماندا لە وڵاتی ئێمە چەندین تابوو هەن باس ناکرێن، تاوتوێ ناکرێن و دەستیان بۆ نابردرێت. لەو باوەڕەدام ئێوەش وەك سەرجەم هاووڵاتیان لە بەرامبەر ئەو تابووانەدا هەست بە نیگەرانی دەکەن. سەرجەم تابووەکان دژبەری دیموکراسین. یەکێك لەو تابووانەی وڵاتی ئێمە پرسی کوردە. هەروەك چۆن هەموو تابوویەك پێچەوانەی ڕاستییە زانستییەکانە، تابووی پرسی کوردیش پێچەوانەی ڕاستییە زانستییەکانە.

ڕاستیی زانستی واتای چی دەگەیەنێت؟ ڕاستییە زانستییەکان سەرجەم ئەو هەبوون و چەمك و دیاردە کۆمەڵایەتی و ڕوحی و سرووشتیانەن کە گرێدراوی ویست و نیاز و داخوازی ئێمە نین و ئێمە هەبین، یان نەبین، ئەوان بەدەر لە ئێمە و بەپێی یاساکانی خۆیان بەڕێوە دەڕۆن.

با بیر بکەینەوە: ئەگەر بخوازین و نەخوازین، ئایا لە دەرەوەی ئێمە دیاردەیەکی کوردی، کێشەیەکی کوردی و گەلێکی کوردی هەیە، یان نییە؟ بێگومان هەیە. ناتوانرێت ڕاستییە زانستییەکان بە قەدەخە یاسایی و نایاساییەکان لە ناو ببرێن و حسێبی نەبووشیان بۆ ناکرێت. کردنی کورد بە تورك بە گوتنی ئەوەی پێ بە بەفردا دەنێن و دەنگی "کارت-کورت" لە ژێر پێیان دێت، نابێت بە زانستیی داتاشراو، بەڵام تورکیا لە دنیای هاوچەرخدا دەکات بە مایەی پێکەنین.

ئەوانەی لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ ژیاون و لەوێ خزمەتیان کردووە، (لەوانەیە ئێوەش)، فرە باش دەزانن و فرە جار دیویانە زۆر کەس لەوێ، بەتایبەتیش ژنان، تورکی نازانن و لەبەر ئەوەی کوردن، تەنیا بەکوردی دەدوێن. ئەو کوردانە لە بنکەکانی جەندرمە، فەرمانگەکانی داواکاری کۆماری، دادگە و دەزگا هاوشێوەکانی تری دەوڵەتدا بەهاوکاریی وەرگێڕ بۆ زمانی تورکی کاروباری خۆیان ڕادەپەڕێنن. لە کاتێکدا ئەمە وایە و ئێوە و من و هەموو تورکیاش پێی دەزانین، هێشتا پێ داگرتن لەسەر نەبوونی کورد لە تورکیا بەکەڵکی چی دێت؟ مادام وایە، پێویستە هەموومان دەست بدەینە دەستی یەك و منەی ڕێگە یاساییەکانی شکاندنی ئەو تابووە بکەین، چونکە بەرگی یاسای داتاشراو و سەپێندراو ڕزیوە و ڕاستیی کۆمەڵایەتی و زانستی لە خۆ ناگرێت. فەرموون لەگەڵ نموونەیەکی ئەمەدا لە ژیانی ڕاستەقینەوە:

هاووڵاتییەکی خەڵکی مدیاد بەناوی شێخموس میرد ناوی کوردیی وڵاتی لە کوڕی نۆ ساڵانی خۆی و ناوی باوەڕی لە کچی حەوت ساڵانی ناوە. بەڕێوەبەرایەتیی باری کەسایەتی لە مدیاد بەبیانووی ئەوەی ئەم دوو ناوە کوردییە "لەگەڵ بنەماکانی ڕەوشت و داب و نەریتدا ناگونجێن و نا میللین"، سکاڵای تۆمار کردووە و داوای کردووە ئەو ناوە کوردییانە لە تۆمارەکانی باری کەسایەتیدا بسڕدرێنەوە.

ئەمە بڕیاری دادگەی مافی ئوسوڵی مدیاد لەو بارەیەوە:

"بەپێی یاداشتی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی باری کەسایەتی و هاووڵاتیان لە وەزارەتی ناوخۆ پێمان ڕاگەیەندراوە ناوەکانی وڵات و باوەڕ بەڕەچەڵەك تورکی نین و بە ئاماژە بۆ مادەکانی پەیماننامەی لۆزانیش ئەو ناوانەی کەمینەکان لە منداڵانی خۆیانی دەنێن، پێویستە لەگەڵ داب و نەریتدا بگونجێن و هیچ تەگەرەیەك لە ئارادا نییە بۆ بە تۆماردانی ناوەکانی وڵات و باوەڕ وەك ناو لە تۆمارەکانی باری کەسایەتیدا لەلایەن هاووڵاتیانی کەمینەوە."

دەقی مادەی 39ی پەیماننامەی لۆزان بەم جۆرەیە: "ئازادیی زمان بۆ کەمینەکان دابین دەکرێت و بە زمانی خۆیان ڕۆژنامە و هەموو جۆرە بڵاوکراوەیەك دەردەکەن."

بە بۆچوونی من ڕاپۆرتەکەی کەسی پسپۆڕ پرۆفیسۆر د. کەیهان ئیچەل هیچ گرنگییەکی نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەیەکی بچووك بۆ یەك دوو بەشی دەکەم.

پرۆفیسۆر ئیچەل لە ڕاپۆرتی خۆیدا دەڵێت:

"پێشاندانی بەشێك لە هاووڵاتیانی کۆماری تورکیا وەك گەل، یان میللەتێکی تر شتێکی مەحاڵە."

هەڵەی ئەم بڕیاردانە بێ گەڕانەوەیە لەمەدایە: ئەوانەی دەیانەوێت کورد وەك گەل و میللەتێکی جیاواز پێشان بدەن، کەسانی تر نین، ڕاستەوخۆ کورد خۆیانن. کەسانێکی دەرەوەی کورد نین. ئەوانەی سەبارەت بە گەلی کورد دەڵێن "گەلێکی جیاواز و نەتەوەیەکی جیاواز نین، تورکن"، تێکدەرانی ڕاستەقینەی یەکپارچەیی و یەکیەتیی تورکیان.

پرۆفیسۆر ئیچەل لە ڕاپۆرتی کەسی پسپۆڕدا بەم ڕستانەش من تاوانبار دەکات:

"بانگەشەی ئەوەی کردووە هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە بە گەلێك بڵێت ''ڕەچەڵەکی تۆ ئەوە نییە، ئەمەیە'' (...) گەورەترین هەڵە بریتییە لە داتاشین و خستنە ڕووی تێگەی مێژوویی 'کورد بوونی نییە، ئەوانە تورکن، (...)"

ڕاستە. لە میانەی لێپرسینەوەمدا لە فەرمانگەی داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵیش هەمان ئەو قسانەم کرد. تەنیا بەکردنی ئەو قسانەشەوە ڕانەوەستام. گوتیشم (تورکیا بە تێگەی مێژوویی

دەستکردی وەك "کورد بوونی نییە، ئەوانە بەڕەچەڵەك تورکن"، کەوتووەتە چاڵێکەوە کە بەدەستی خۆی هەڵی کەندووە. ئەو تێگەی کە لە داهێنانی ئێمەیە، سەردەمێکی درێژە لە عێراقیش پەیڕەو دەکرێت، دوو ملیۆن تورکی عێراق –بە شێوەیەکی گشتی لە موسڵ و کەرکوك- بەزۆر کراون بە عەرەب و ژمارەیان لە دوو ملیۆنەوە دابەزیوە بۆ 300 هەزار کەس. لەوێ ناونانی منداڵان بەناوی تورکی قەدەخەیە، بەڵام حکوومەتەکانی تورکیا لە بەرامبەر وەرگرتنی نەوت و لە ڕووی بەرژوەندیی ترەوە نەیانتوانیوە لە بەرامبەر ئەو پێشێلکارییانەی مافی مرۆڤ لە عێراق دەنگ هەڵبڕن.) هەر ئەوەندەش نا. بولگارەکانیش هەمان تێگەی دەستکردی ئێمەیان وەك خۆی وەرگرتووە و تێگەیەکی مێژوویی دەستکردیان بۆ خۆیان داتاشیوە و بانگەشەی ئەوە دەکەن بەهیچ جۆرێك تورك لە بولگارستان بوونیان نییە و ئەوانەی خۆیان بە تورك دەزانن، سلاڤ (بولگار)ی بە موسڵمانبوون و دوو ملیۆن تورك کە یەك لە نۆی ژمارەی دانیشتووانی بولگارستان پێك دەهێنن، بەزۆر کراون بە بولگار. حکوومەتی ئێمەش لە بەرامبەر ئەوەدا جگە لە چەند خۆپێشاندانێکی بچووك لە کۆبوونەوەکانی وڵاتانی عەرەبی، هیچ چالاکییەکی بەهەندی ئەنجام نەداوە. ئەگەر کێشەی کورد لە تورکیا بە ڕێبازی دیموکراسی و لە چوارچێوەی سیاسیەتی یەکیەتیی تورکیادا چارەسەر نەکرێت، ملیۆن و نیوێك تورکی بولگارستانیش وەك دوو ملیۆن تورکەکەی عێراق لە ناودەچن.

کار هەر بەوەندەشەوە نەوەستاوە. یۆنانستانیش کە هەمان تێگەی دەستکردیی مێژوویی کتومت وەك خۆی پەیڕەو دەکات، دەستی کردووە بە گوتنی ئەوەی کە تورك لە ڕۆژئاوای تراکیا بوونی نییە و دەڵێت ئەوانەی خۆیان بە تورك دەزانن، یۆنانین و بە زەبری شمشێر کراون بە موسڵمان و حکوومەتی تورکیش لە ئاستی ئەم ڕووداوە گوێی خۆی کەڕ کردووە.

سەرۆکی بەڕێز و دادوەرانی بەڕێز، وەك ئەوەی لە خوارەوە ڕوونی دەکەمەوە، تا مرۆڤ بەتەواوی نەگات بە ئازادیی مرۆڤبوونی خۆی و تا "میت" و داواکارانی کۆماری تێ نەگەن ئازادیی مرۆڤ واتای چییە و تا ڕاستی پارێزان هێشتا سزا بدرێن و تا بێباکی بەردەوام بێت، ترسی ئەوەم هەیە ڕۆژێك بێت بانگەشەی ئەوە بکرێت کە تورکەکانی دانیشتووی تورکیاش تورك نین.

ئومێدم وایە کەسی پسپۆڕ پرۆفیسۆر د. کەیهان ئیچەل و بەڕێز بولبان ئاکباشی داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەتیش سوود لە لێدوانە کورتەکانم سەبارەت بە ئازادیی مرۆڤ وەربگرن.

سەرووشتیترین و لە پێشترین و سەرەتاییترین ئازادیی هەر مرۆڤێك ئازادیی مرۆڤبوونیەتی. سەرجەم ئازادییەکانی تر (بیرکردنەوە، باوەڕ و هاوشێوەکانیان) لە دوای ئازادیی مرۆڤبوونی مرۆڤەوە دێن. بەدرێژاییی مێژووش لە هیچ جاڕنامەیەکی مافی مرۆڤدا نەنووسراوە "ئازادیی مرۆڤبوونی مرۆڤ"، چونکە ئازادیی مرۆڤبوونی مرۆڤ چەمکێکی ئاشکرایە (بەڵگەنەویست –Axiom-ە، ددان پێدانراوە و شتێکە پێویست ناکات ڕاستبوونی بسەلمێنرێت.) واتا هیچ کەسێك داوا لە هیچ کەسێکی تر ناکات مرۆڤبوونی خۆی بسەلمێنێت، چونکە مرۆڤ بێ ئەوەی پێویستی بە سەلماندن بێت، مرۆڤە.

نیشانە و تایبەتمەندیی ئازادیی مرۆڤبوونی مرۆڤ بەپێی سەردەم گۆڕانی بەسەردا دێت. لەم چاخەی ئێمەدا سەرەکیترین نیشانەی ئازادیی مرۆڤبوونی مرۆڤ ئەوەیە مرۆڤ ئازاد بێت لە دیاریکردنی ناسنامەی نەتەوەیی و کەسایەتیی خۆی. واتا مرۆڤ تەنیا خۆی دەتوانێت پەیوەندارییی نەتەوەییی خۆی دیاری بکات. ئەگەر ئەم قسەیە بەدڵی ئەوانەش نەبێت کە دەیانەوێت لەم چاخەدا درێژە بە سەردەمە کۆنەکان بدەن، دەبێت بزاندرێت لەم سەردەمەدا مرۆڤێك ناتوانێت ناسنامەی نەتەوەیی و کەسایەتیی مرۆڤ و ناسنامەی نەتەوەیی و کەسایەتیی دایك

و باوك و باپیر و باپیرەگەورانی مرۆڤ دیاری بکات. مرۆڤ هەروەك چۆن ئازادە لە هەڵبژاردنی ناسنامەی نەتەوەییی و کەسایەتیی دایك و باوك و باپیرانی، بەهەمان شێوە خاوەنی مافی هەڵنەبژاردنیەتیشی. بۆ نموونە، هەر مرۆڤێك دایك و باوکی لە چ نەتەوەیەك بێت، ئازادە لە بوونی بە ئەندامی ئەو نەتەوەیەی کە خۆی ئارەزووی دەکات و ئەگەر بەر لە هەموو شتێك ددان بە ئازادیی مرۆڤبوونی مرۆڤدا نەنرێت، سەرجەم ئازادییەکانی تر هیچ واتایەکیان نابێت. بەتایبەتیش وڵاتێکی وەك تورکیا کە دەیان هەزار ساڵە بووە بە خەرمانی مێژوو و مرۆڤ و نەتەوەکان، ناتوانرێت پەیوەنداریی مرۆڤ بۆ نەتەوەیەك لە نەتەوەکان لە ڕێی پەیوەندیی دایك و باوك و پەیوەندیی خوێنەوە دەستنیشان بکرێت. ئا لەم سۆنگەیەوەیە کاتێك کۆمەڵێك مرۆڤ لەوانەی لە تورکیا دەژین و تێکەڵ بە مێژووی تورك بوون، ئەگەر بە خۆیان بڵێن کورد، هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە بڵێت لەبەر ئەوەی باب و باپیرانیان تورك بوون (ئەگەر تەنانەت ئەم تێگە داتاشراوە ڕاستیش بێت)، ئەمان کورد نین و تورکن. کەس مافی ئەوەی نییە تورکبوونیان بەسەردا بسەپێنێت.

مەرجی سەرەکیی نەتەوایەتی لەم چاخەی ئێمەدا پشت دەبەستێت بە ویستی مرۆڤەکان بۆ پێکەوە ژیان لە سایەی یەکیەتیی بەرژەوەندیی ئابووریدا. ئەمەش بە ویستی ئازادی مرۆڤ و بەشێوەی دڵخوازانە پێك دێت. ئەو وڵاتانەی کە بە زەبری یاسا، یان گوشاری نایاسایی نەتەوەییبوون دەسەپێنن، ئیدی لە دنیای هاوچەرخ و شارستانیدا جێیان نابێتەوە.

ئەوەی من لەم بابەتەدا دەمەوێت، ئەوەیە یاسای ئاماژە بۆ کراو بە دیموکراسیترین و یاساییترین ڕێباز بگۆڕدرێت و کوردەکانیش سەرجەم مافە کلتوورییەکانی خۆیان بەدەست بخەن بۆ ئەوەی تورکیا لە دنیای هاوچەرخدا جێی خۆی بگرێت.

هانی کەسم نەداوە یاسا بشێوێنێت و دنەی کەسم نەداوە بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی. گرنگترین ئەرکی هاووڵاتیبوونم ڕاپەڕاندووە و کەڵکم لە مافی خۆم وەرگرتووە و دیموکراتیزەکردنی یاسایەکی لەگەڵ ئەم چاخەدا نەگونجاو دەخوازم و هەمیشەش دەمەوێت.

لەگەڵ ڕێزمدا.

سەرۆکی دەستەی دادوەران پرسیاری دوایین وتەمی کرد. تاوانبارکراوان بە شێوەیەکی گشتی پاش بەرگریکردن لە خۆیان، لە دوایین وتەدا داوا دەکەن بێتاوان دەربخرێن. من دوایین وتەی خۆم لەو دانیشتنەی دادگەدا لە ژمارەی ڕۆژی 1988/7/1ی ڕۆژنامەی "جمهوریەت"ەوە وەردەگرم کە هەواڵەکەی بڵاو کردووەتەوە:

"چاخی ترسانی من بەسەرچووە. داوای بێتاوان دەرخستنیش ناکەم. ئەوە وڵات، ئەوە داواکاری کۆماری، ئەوە من، ئەوە کورد و ئەوەش ئێوە. چیتان دەوێت، ئەوە بکەن."

***

پاشان پارێزەر وەلی دەڤەجیئۆغڵو لەبەردەم دادگە بەرگرینامەیەکی تێر و تەسەلی پێشکەش کرد و لە سەرەتادا گوتی "ئۆگوست کۆنت دەڵێت: ''بۆ ئەوەی بتوانین بەباشی لە بیرۆکەیەك تێ بگەین، پێویستە لە مێژووەکەی بکۆڵینەوە.'' کێشەی کورد کە هێشتا ژیانیترین بابەتی ڕۆژەڤی تورکیایە، تا دوێنێی نەزانڕێت، مەحاڵە وەك پێویست ئەمڕۆی ڕوون بکرێتەوە و هەڵبسەنگێندرێت. دیارە هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ڕابردوویەکی هەیە و ئەو سەردەمەی تیایدا دەژین، وەری دەگرێت و بە شێوەیەك لە شێوەکان ڕادەستی داهاتووی دەکات.

بۆیە پێویستە هەبوونی مێژوویی کورد، ئەو نیشتمانەی لێی دەژین، هەوڵ و تێکۆشانی ئابوورییان، پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کۆمەڵگەکانی تردا و ژیانی کۆمەڵایەتی و کولتووریی لەسەر گشت ئەوانە بنیاتنراویان بزاندرێت، تا ئەمڕۆ بتواندرێت بڕیاری ڕاست لە بارەی کۆمەڵگەی ئەمڕۆی کوردەوە بدرێت و سەرچاوەی کێشەکان دەستنیشان بکرێن و چارەسەری دروست بەرهەم بهێندرێت."

(...)

"...ئەو مرۆڤانەی ئێوە دادگاییان دەکەن، وەك ئێمە مرۆڤی ئاسایی و فانی نین. وەك بەختێکی گەورەی نەتەوەمان لە ناو ئێمەوە پەیدا بوون و مایەی شانازیی گەلی تورك و ئەم نیشتمانەن. نەوەکانی داهاتوو لە سۆنگەی ئەوەی مرۆڤی هەمان نەتەوەی ئەمانن، شانازییان پێوە دەکەن. ئێمەی مرۆگەلی بەختەوەر بەرێککەوت لە نێزیك ئەوانەوەین و کتێبە واژۆکراوەکانی ئەوان وەك گەورەترین میراتی لە پاش خۆمان بۆ منداڵەکانمان بەجێ دەهێڵین.

ئەوانە بەها و ڕووی گەشی نەتەوەی ئێمەن. تورکیای ئێمە وڵاتێکە لە کاروانی شارستانی دواکەوتووە. بەڵام لە هەموو ڕوویەکەوە وا نییە. بۆ نموونە، باوەڕم وایە لە بواری ئەدەبیاتدا شان لە شانی پێشکەوتووترین دەوڵەتان دەدەین.

ئاواتەخوازم و حۆزگە دەخوازم دادوەریشمان بەهەمان شێوە بێت. بۆ پێشاندانی ئەوەش هەلێکی مێژووییتان لەبەر دەستدایە. ئەنادۆڵ بێشکەی شارستانییە گەورەکانە و نەتەوەکەشمان میراتگری ئەو شارستانییانەیە. وەك خۆ فوودانێك بۆ تاسەکردنی ڕابردوو نا، بگرە لە باوەڕێکی لە دڵەوە هەڵقوڵاو ئەمە دەڵێم.

موەکیلەکانم هیچ پەیوەندییەکیان بەو تاوانەوە نییە و نایانبێتیش.

بەم هەستەوە ئارەزوو دەکەم بڕیار لەسەر بێتاوانبوونی هەموویان بدەن. ڕێز دەنوێنم.

پارێزەر وەلی دەڤەجیئۆغلۆ

***

## بڕیاری بێتاوان دەرخستن

**بڕیاری دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ**

**بڕیار**

**ژمارەی بناغەیی:** 1987/258
**ژمارەی بڕیار:** 1988/157
**ژمارەی داواکاری کۆماری:** 1987/242
**سەرۆك:** گولتەکین توران
**ئەندام:** شەمسەدین شانال 15592
**ئەندام:** فیکرەت ئولوچ 15779
**یاریدەری داواکاری کۆماری:** گویهان ئولگەن 18589
**نووسەر:** جەمال گۆكگوێز
**داواکار:** ك. ه
**تاوانبارکراوان:**

1) محەمەد عەلی بایار: کوڕی تەحسین و عالیەیە، لە دایکبووی ساڵی 1926ه، لە بەیئۆغلۆی ئیستانبوڵ تۆمار کراوە و لە بەبەك ئیبتکار ئارالغی – ژمارە 14/4 دادەنیشێت.
2) محەمەد نوسرەت نەسین (عەزیز نەسین): کوڕی عەبدولعەزیز و حەنیفەیە، لە دایکبووی ساڵی 1915یە لە ئیستانبوڵ، لە گوندی گۆربەکی سەر بە گیرەسۆن تۆمار کراوە و لە وەقفی نەسین لە قەزای چاتالجە دادەنیشێت.
3) فاتمە یازجی: کچی محەمەد نیازی و عالیەیە، لە دایکبووی ساڵی 1955ه، لە گوندی شوباسی سەر بە قەزای کەمالیە تۆمار کراوە و لە شەقامی کاباکولاك – ژمارە 6/3، قەرەگومرك – ئیستانبوڵ دادەنیشێت. لێپرسراوی گۆڤاری بەناو "ئیکیبینە دۆغرو"ە.

تاوان: لاوازکردن و لە ناوبردنی هەستە میللییەکان لە ڕێی وەشان و بڵاوکردنەوەوە.
مێژووی تاوان: 1987/8/9

تاوانبارکراوان محەمەد عەلی بەیار و هاوڕێکانی بە "لاوازکردن و لە ناوبردنی هەستە میللییەکان لە ڕێی بڵاوکردنەوەوە" تاوانبار کراون و فەرمانگەی داواکاری کۆماری لە دادگەی تەناهیی دەوڵەت لە ئیستانبوڵ داواکارینامەی ژمارە 1987/206، بناغە 1987/242ی بە مێژووی 1987/12/28 بەپەلە بۆ دادگەی ئێمە ڕەوانە کردووە بەمەبەستی کردنەوەی دۆز لە دژی تاوانبارکراوان. لە ئەنجامی دانیشتنەکانی دادگاییکردندا؛

**باوەڕ دەکرێت:**

**داواکردن: تاوانبارکراوان محەمەد عەلی بایار-محەمەد نوسرەت نەسین و فاتمە یازجی بەپێی ئەوەی سەرپێچییان لە مادەی 142/3-6ی یاسای سزای تورك کردووە، دۆز لە دژیان کراوەتەوە و داواکاری کۆماری دوای ئەنجامدانی لێپرسینەوە، داوای کردووە تاوانبارکراوان محەمەد عەلی بایار و محەمەد نوسرەت نەسین بە مادەی 142/3-6 و تاوانبارکراو فاتمە یازجی بە مادەی 16/1. لە یاسای ژمارە 1987/258 و بە مادەی 142/3-6 لە یاسای سزای تورك سزا بدرێن.**

**لێپرسینەوە و بەرگری:**

**لە لێپرسینەوە و بەرگرینامەی تاوانبارکراو فاتمە یازجیدا هاتووە: "ئەو داواکردنە ڕاست نییە، سەرنووسەری گۆڤاری هەفتانەی ''ئیکیبینە دۆغرو''ە، وتاری سەبارەت بە چارەسەرکردنی پرسی کورد لە ژمارە 32ی 9-1987/8/15دا پێشتر ئەم دیوێتی و پاشان بڵاو کراوەتەوە، هیچ ڕەگەزێکی پێشێلکاری مادەی 142 لە یاسای سزای تورك لەو وتارەدا نابینێت و لەو ڕوانگەیەشەوە بڵاوی کردووەتەوە، ڕاپۆرتی کەسی پسپۆڕ سەبارەت بە دۆزینەوەی ڕەگەزی تاوان بە زانستی نازانێت، پرسی کورد لە وڵاتانی تری وەك ئەڵمانیا و ئەمریکا بە ئاشکرا تاوتوێ دەکرێت، تاوتوێکردنی لە تورکیا هیچ ئەنجامێکی زیانبەخشی نابێت، بڵاوکردنەوەی بۆچوونی کەسانی بەنرخ سەبارەت بەو بابەتە مایەی شانازییە، ئەرکی هاووڵاتیبوونە، "بێتاوانە" و داوای کردووە بڕیار لەسەر بێتاوانبوونی بدرێت.**

**لە لێپرسینەوە و بەرگرینامەی تاوانبارکراو محەمەد نوسرەت نەسیندا هاتووە: "بیرۆکەی نووسینی لە داواکارینامەدا ئاماژە بۆ کراو هی خۆیەتی، لەلایەن خۆیەوە ڕاگەیەندراوە، بەهیچ جۆرێك ڕەگەزەکانی مادەی 142/3 لە یاسای سزای تورك لە لێدوانەکانیدا نییە، تەواوی بابەتەکە بریتییە لە وەڵامی پرسیاری ئایا لە تورکیا کورد هەیە یان نییە؟، دەوڵەتی تورکیا لە هەڵوێستی سیاسیی خۆیدا بانگەشەی نەبوونی کورد دەکات، ئەم بۆچوونە هەڵەیە، ناکرێت هیچ کەسێك لە ئاشکراکردنی ڕەچەڵەکی خۆی قەدەخە بکرێت، لە بولگارستان تورك و لە تورکیاش کورد هەیە، هەموو مەسەلەکەی پێ پەسەندە و بابەت ئەوەیە ئەم ناخوازێت ئەو کۆمەڵانە تەگەرە بۆ یەکیەتیی ئەو دەوڵەتانە دروست بکەن، بەو جۆرە لە ڕەوشەکە حاڵی بووە، کردنەوەی دۆزێکی لەم جۆرە پێچەوانەی سیاسەتی تورکیایە، دواجار لە وتارەکە و بەشێوەیەکی گشتیش لە بیر و بۆچوونەکاندا ڕەگەزی تاوانبارکردن نابینێت" و داوای کردووە بڕیار لەسەر بێتاوانبوونی بدرێت.**

**لە لێپرسینەوە و بەرگرینامەی تاوانبارکراو محەمەد عەلی بایاردا هاتووە: (...)**

**بەڵگەکان-هەڵسەنگاندن و تاوتوێکردنیان: لە ڕاپۆرتی کەسی پسپۆڕ پرۆفیسۆر کەیهان ئیچەل و لە ناوی هەنووکەییی ئەو گۆڤارەوە وەك ئەوەی لە دۆسیەکەدا هاتووە و لە نووسینی ناو ئەو گۆڤارەوە کە تاوانبارکراوان بۆچوونەکانی خۆیان تێدا خستووەتە ڕوو، ڕوون بووەتەوە فاتمە یازجی سەرنووسیاری گۆڤاری "ئیکیبینە دۆغرو"ە، دەستنیشان کراوە کە بۆچوونەکانی ناو وتاری "چارەسەر بۆ پرسی کورد" لە ژمارە 32ی مێژووی 9-1987/8/15ی ئەو گۆڤارە بیر و بۆچوونی تاوانبارکراوەکانی ترە، تاوانبارکراو محەمەد نوسرەت نەسین (عەزیز نەسین) بۆچوونی خۆی لە ژێر سەردێڕی "پێویستە مافە کولتوورییەکان بدرێن"دا بەیان کردووە، تاوانبارکراو محەمەد عەلی بایاریش بۆچوونی خۆی لە ژێر سەردێڕی "شەڕی ڕزگاریی نەوەتەوەیی دەکەین"دا خستووەتە ڕوو، لێدوانەکانی هەردوو تاوانبارکراو ڕەگەزی تاوانی پڕوپاگەندەکردن بۆ لاوازکردن و نەهێشتنی**

هەست میللییەکان لە خۆدەگرن وەك ئەوەی لە مادەی 142/3ی یاسای سزای تورکدا هاتووە و لەبەر ئەو هۆیە ئەم دۆزە کراوەتەوە.
لە ئەنجامی دانیشتنەکانی دادگەدا گەیشتینە باوەڕێك ئەو تاوانەی دراوەتە پاڵ تاوانبارکراون ڕەهەندی مەبەستداریی تێدا نییە و لەبەر ئەو هۆیە ڕێی بڕیاردان لەسەر بێتاوانبوونی سەرجەم تاوانبارکراوان گیرایە بەر.
بە واتای: وەك ئەوەی لە ڕاپۆرتی کەسی پسپۆڕیشدا ئاماژەی بۆ کراوە، تاوانبارکراو عەزیز نەسین گوتوویەتی: "باسکردنی ئەو بابەتە لە سایەی یاساکانی ئەمڕۆدا مەحاڵە، یاساکان توانای دۆزینەوەی چارەسەریان بۆ کێشەی کورد لەناو بردووە، ناخوازێت بەئاشکرا خۆی بخاتە خانەی تاوانکردنەوە، ئێستا کورد بەدەستی  کورد دەکوژرێت و کورد تورك دەکوژێت و سەرباز دێنە کوشتن و زەمانی چارەسەرکردن زۆر دواکەوتووە، گەورەترین هەڵە بریتییە لە نکۆڵیکردن لە گەلێك بەتەواوی، هەمان گەمە بەسەر ئێمەش هات، بولگارەکان بەهەمان فەلسەفە حسێبی نەبوو بۆ تورکەکانی ئەوێ دەکەن، لەبەر ئەوەی ئێمەش هەمان شت دەکەین، نەمانتوانیوە هەڵوێستێکی ڕوون و ئاشکرامان هەبێت، هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە بە گەلێك بڵێت ''ڕەچەڵەکی تۆ ئەوە نییە، ئەمەیە''، گەلێك هەیە بەناوی گەلی کورد، تێکۆشانی سەربەخۆییی گەلی کورد وەك تێکۆشانی سەربەخۆییی کولتوور تێ دەگات، لایەنگری سەربەخۆییی سیاسی نییە، ئەوە لە بەرژوەندیی کوردیش نییە، تیرۆر ڕێی بەرژووەوەندی نییە، تیرۆری دژ بە تیرۆریش ڕێی بەرژوەندی نییە، کێشەکە بەو ڕێبازانە چارەسەر نابێت کە ئەمڕۆ دەوڵەتی تورك دەیانگرێتە بەر، گەورەترین هەڵە بریتییە لە داتاشین و خستنە ڕووی تێگەی مێژوویی ''کورد بوونی نییە، ئەوانە تورکن''، ئەگەر دوای خۆشگوزەرانیی ئابووری مافە کولتوورییەکانیش بدرێت، دەکرێت بارودۆخەکە بگەیەندرێتە خاڵێکی نەرمتر، شتێکی ڕاست نییە ئەگەر گەلی کورد ئەو بزووتنەوانە بە هی خۆی بزانێت، ئەوانەی خوازیاری سەربەخۆییی کوردن، هەڵە دەکەن ڕێگەی چارەسەر بە پەسەندکردنی هەبوونی کورد و پەسەندکردنی ڕاستیی مێژوویی و زانستیدا تێ دەپەڕێت."
تاوانبارکراو لەو نووسینەدا تورکەکانی نیشتەجێی هەرێمی ڕۆژهەڵاتی وەك کورد پێشان داوە و بە پێویستی زانیوە سەربەخۆییی کولتووریيان پێ بدرێت و لە بەرامبەر ئەو بۆچوونەدا کە تاوانبارکراو بەم دەربڕینانە جواداخوازی کردووە، بە لەبەر چاوگرتنی سەرلەبەری نووسینەکە ئاشکرا دەبێت لە ڕوانگەی تاوانکردنەوە هەڵسوکەوتی نەکردووە.
بەتایبەتیش تاوانبارکراو ڕوونی کردووەتەوە "تیرۆر ڕێی چارەسەر نییە، ڕووداوە تیرۆریستییەکانی ڕۆژهەڵاتی سەرکۆنە کردووە، لایەنگری سەربەخۆییی سیاسی نییە، بەپێویستی دەزانێت خۆشگوزەرانیی ئابووری بگەیەندرێتە ئەو هەرێمەش، داخوازیکەرانی سەربەخۆییی کورد هەڵە دەکەن" و بەم جۆرە پێشانی داوە بەمەبەستی لاوازکردنی هەستە نەتەوەیییەکان هەڵسوکەوتی نەکردووە.
(...)
ئەنجام:

1- هەرچەندە بەتۆمەتی سەرپێچیکردن لە مادەی 142/3ی یاسای سزای تورك دۆز لە دژی تاوانبارکراو محەمەد نوسرەت نەسین کراوەتەوە و؛ ئەگەرچی بەپێی ڕاپۆرتی کەسی پسپۆڕ، تاوانبارکراو لە ژێر سەردێڕی "پێویستە مافە کولتوورییەکان بدرێن" لە وتارەکەی گۆڤاری "ئیکیبینە دۆغرو"دا، هاووڵاتیانی نیشتەجێی هەرێمی ڕۆژهەڵاتمان وەك گەل و نەتەوەیەکی جیاواز پێشان دەدات و ڕوون

کراوەتەوە کە بەم کارەی جوداخوازیی کردووە؛ دادگە گەیشتە ئەو باوەڕەی کە تاوانبارکراو لەو سۆنگەیەوە هەڵسوکەوتی نەکردووە.

2- هەرچەندە بەتۆمەتی سەرپێچیکردن لە مادەی $142/3$ی یاسای سزای تورك دۆز لە دژی تاوانبارکراو محەمەد عەلی بایار کراوەتەوە و؛ ئەگەرچی بەپێی ڕاپۆرتی کەسی پسپۆر، تاوانبارکراو لە ژێر سەردێڕی "شەڕی ڕزگاریی نەتەوەیی دەکەین" کە لە هەمان گۆڤاردا بڵاو کراوەتەوە، بەشێك لە هاووڵاتیانی کۆماری تورکیا لە دەرەوەی نەتەوەی تورك پێشان دەدات و ڕوون کراوەتەوە بەم کارەی جوداخوازیی کردووە؛ دادگە گەیشتە ئەو باوەڕەی کە ئەم تاوانبارکراوە بەمەبەستی جوداخوازی پڕوپاگەندەی نەکردووە و بەڵگەی تەواو بەدەستەوە نییە بۆ سەلماندنی ئەوەی پڕوپاگەندەی جوداخوازی کردبێت.

تاوانبارکراو فاتمە یازجی سەرنووسەری گۆڤاری "ئیکیبینە دۆغرو"ە و بەهۆی ئەو لێدوانانەی کە تاوانبارکراوانی تریان پێ تۆمەتبار کراوە، بەپێی مادەی $16/1$ لە یاسای چاپەمەنی دۆز لە دژی ئەمیش کراوەتەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی دادگە گەیشتە ئەو باوەڕەی ئەو تاوانانەی دراوەتە پاڵ تاوانبارکراوانی تر ڕەهەندی مەبەستداری تێدا نەبووە، دادگە بە کۆی دەنگ و بەجۆرێك بۆ پێداچوونەوە شیاو بێت، بڕیاری لەسەر بێتاوانیی تاوانبارکراوان دا. تاوانبارکراوان محەمەد عەلی بایار و فاتمە یازجی ئامادەی دانیشتنی دادگە بوون و بڕیاری وەرگیراو لە بەردەمیان خوێندرایەوە. لە ئامادەنەبوونی تاوانبارکراوی تر، محەمەد نوسرەت نەسیندا، بڕیارەکە بە ئامادەبوونی داواکاری کۆماری چایهان ئولگەن لە فەرمانگەی داواکاری کۆماری لە بەردەم تورگوت کازان و وەلی دەڤەجیئۆغلۆ و راسیم ئۆزی پارێزەرانی تاوانبارکراودا خوێندرایەوە و ڕاگەیەندرا.

| سەرۆك | ئەندام | ئەندام |
|---|---|---|
| گولتەکین توران | شەمسەدین شانال | فیکرەت ئولوچ |

***

## بەڵگەنامەكان:

## وتارەكانی دكتۆر كەمال مەزهەر ئەحمەد

**عەزیز نەسین**

### نووسەری گەورە و مرۆڤی كەم هاوتا و دۆستی نزیكی گەلی كورد

**د. كەمال مەزهەر ئەحمەد**

**بەشی یەكەم**

(ڕۆژنامەی هاوكاری، ژمارە 1120، ڕۆژی 1989/10/23، ل 5)

پێم وایە دەگمەن كوردێكی خوێندەوار هەڵدەكەوێ بەرهەمێكی عەزیز نەسینی بەرچاو نەكەوتبێ. یا هیچ نەبێ جارەهای جار ناوی نەبیستبێ. هەر كوردێكیش دێڕێكی یەكێك لە بەرهەمە ناوازەكانی خوێندبێتەوە لە قوڵایی دڵەوە خۆشی دەوێ و هەرگیز لە یادی ناكات.

بۆ ئەمە برایان عەبدوڵای حەسەن زادە و سەعید یەحیا و هیمدادی حوسەین و هەموو ئەوانەی بەرهەمەكانی عەزیز نەسینیان كردۆتە كوردی شایستەی سوپاسی تایبەتین.

عەزیز نەسین نووسەری هەرەبەناوبانگی توركیای هاوچەرخە. بەرهەمەكانی لە دەرەوەی توركیا زۆر ناسراون. – بەم جۆرە دەستەیەك ڕۆژهەڵاتناس لە لاپەڕە 283 ی كتێبی "توركیای هاوچەرخ" دا، ئەو نووسەرە گەورەیەیان نرخاندووە. تەمەنی ئەو هەڵسەنگاندنە بیست و پێنج ساڵ، واتە چارەكە سەدەیەكە. ئاخۆ ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە ئێستا عەزیز نەسین چۆن بنرخێنن دوای ئەوەی وەك نووسەر و وەك مرۆڤ لەو ماوە دور و درێژە دا توانی هەزار هەنگاوی تر بەرەو پێش بنێ.؟

عەزیز نەسین كە بە پتر لە دوو سەد ناوی جیاوازەوە بەرهەمی بڵاوكردۆتەوە دوا ناوناوی محەمەد نوسرەت عەزیزە (لە هەندێك سەرچاوەی ئینسكلۆپیدیا لە بریتی محەممەد مەحمود نووسراوە) ساڵی 1915 بە شاری ئەستەمووڵی پایتەختی ئەوسای وڵاتی عوسمانی لە دایك بووە. واتە ، خواوەندی گەورە دەست بە باڵیەوە بگرێ و تا دێ تەمەنی درێژ كات، خەریكە خۆی دەدات لە حەفتا و پێنج ساڵان.

ڕۆژ و مانگی لە دایكبوونی نەزانراوە. ئەوەیش نیشانەی ساكاری بنەماڵەیەتی، كە لە بنەڕەتدا لە خێزانە هەژارەكانی ئەنەدۆڵ بووە. عەزیز نەسین بۆ خۆی شانازی بەو هەژارییەوە دەكات. چونكە خۆی واتەنی لەگەڵ زۆرینەی گەلدا لە ریزێكدا كۆی كردۆتەوە, هەڵبەت باری سەختی ژیانی هەژاری دەبوو بە خەست و خۆڵی لە بەرهەمەكانیدا ڕەنگ بداتەوە.

عەزیز نەسین دوو ژنی هێناوە و چوار منداڵی هەیە. ئەوانەی دیویانە دەڵێن بە لەبزی شیرین و بیری ورد و مرۆڤانە و رەفتاری بەرز و بەرگی ساکاری یەکسەر خۆی دەئاخنێتە ناو دڵ و دەروونەوە و وێنەیەکی نەمر لە یاد و خەیاڵدا دروست دەکات.

دوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی عەزیز نەسین چۆتە فێرگەی سەربازیی ناوەندی و لە تەمەنی بیست ساڵاندا لە فێرگەی سەربازیی باڵا وەرگیراوە و لە ساڵی 1937 بۆیتە ئەفسەر. یا خۆی واتەنی لەو ساڵەدا ناپلیونێکی دیکە لە دایك بوو. دیارە عەزیز نەسین لێرەدا گاڵتە بە خۆی دەکات. هەرچەندە راستە شۆڕەسوارێکی وەك ناپلیۆن، بەڵام لە مەیدانی فکر و ئەدەبدا، هاتە گۆڕێ.

سەربازگەری و شیر و تیرسازی لەگەڵ هەستی ناسکی شاعیرانەی عەزیز نەسیندا نەدەگونجا، بۆیە دوای حەوت ساڵان دەستی لە ئەفسەری هەڵگرت و کتێبخانەیەکی کردەوە و ماوەیەکیش بووە وێنەگر و بەقاڵ. بەرلەوە عەزیز نەسین کەوتبووە شیعر نووسین و خولیای هونەر دابووی لەسەری و ماوەیەکی بە خوێندنەوە لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان بردە سەر. لەوساوە عەزیز نەسین بە جارێك تێکەڵ بە کۆڕی بایەخداری رۆژنامە و چیرۆکنووسی بوو. دەستی لە شیعر هەڵگرت و تا ئێستا تەنها یەك دیوانی بڵاوکراوەی هەیە. هەر زوو نازیم حیکمەتی شاعیری بەناوبانگ تێی گەیاندووە کە دەستی لە شیعربێژییدا کورتە. بۆ خۆیشی بەم جۆرە باسی شاعیرێتی خۆی دەکات:

"ئەو کاتە تەمەنم سیازدە ساڵان بوو. وەك هەر لاوێکی تورکی شیعرم دادەنا. لە وڵاتی ئێمە لە نێو هەردوو کەسدا سێیان شاعیرن."

لە رێگەی رۆژنامەنوسی یەوە عەزیز نەسین باشتر لە دەرد و ئازاری جەماوەر و برینە پڕ ئێش و نەخۆشی یە کوشندەکانی کۆمەڵ تێگەیشت.

لە ساڵی 1946ەوە دایە پاڵ نووسەری پێشکەووتوخوازی بە ناوبانگی تورکیا صەباحەددین عەلی (1907-1948) کە بەر لەوە بە ساڵێك کەوتبووە بڵاوکردنەوەی گۆڤاری گەپنووسی (ساتیری) مارکۆ پاشا. گۆڤارە چیرۆك و وتارە رەخنەیی یە زووەکانی عەزیز نەسینی بڵاوکردەوە. ساڵی 1948 بە کوشتنی ناڕەوای صەباحەدین عەلی "مارکۆ پاشا" لە دەرچوون کەوت.

دیارە خاوەن خامە و بیری وەك عەزیز نەسین نەیدەتوانی دەسەوەسان دانیشێ. کوشتنی هاوڕێ و هاوبیری شاڵاوی رقی پیرۆزی توند و تیژتر کرد. ساڵی نەبرد کەوتە دەرکردنی گۆڤاری "کەشتی نوح" (نوح واپۆرو) کە وەك "مارکۆ پاشا" ئازایانە بە دەم گاڵتەپێکردنی قووڵی پڕ تەوسەوە دەردەکانی کۆمەڵی شی دەکردەوە و سەبەبکارانی ریسوا دەکرد.

نەسین بەو جۆرە دەیویست وەك نوح بە کەشتی یە تایبەتی یەکەی خۆی کۆمەڵ لە کێشە کوشندەکانی قورتار بکات، هەر وەك چۆن لای خۆشمان مامۆستا مەلا نەجمەدینی نەمر، رەحمەتی خوای لێ بێ، دەیویست بە کەشتی یە بێ هاوتاکەی لاوانی کوردی لە بەڵای ناگاهانی نەخوێندەواری و بەرهەمی دەگمەنی کوردی لە مەترسی فەوتان رزگار بکات.

بڕوا بفەرموون ئەرکی سەر شانی خاون کەشتی نوحەکەی خۆمان سەختتر بوو، چونکە ئەمیان بە ژیانی کولەمەرگی ئەو کارە پیرۆزەی رادەگەیاند و زۆر بە داخەوە ببووە گاڵتەجاڕی گەلێك نەفام.

هەرچۆن بێ زۆر خۆشە بیری وردی عەزیز نەسینێکی لە هەموو جیهاندا ناسراو لەگەڵ بیری وردی خوێندەوارێکی هەڵکەوتووی کوردی لە کەم شوێن ناسراو بەو جۆرە یەك بگرنەوە.

کەشتی یەکەی عەزیز نەسین زۆری کرد، بەڵام کەمی بڕی. دوژمنانی ژیانی ئاسایی بە جوانەمەرگی لە سەرەتای ژیاندا بە زۆری زۆردارەکی سەریان پێ نایەوە. دیسان نووسەری گەورە دەستی هەڵنەگرت.
ئەم جارە رووی کردە رۆژنامە و گۆڤارە هەرە بڵاوەکانی تورکیا کە راست و چەپیان بە شانازی یەوە دەرگەیان بۆ نووسینەکانی خستە سەر گازی پشت بێ ئەوەی زۆر جار بزانن عەزیز نەسین خاوەنیانە. بە دەیان نازناوی جیاوازەوە کەوتە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی، لە "یەنی گەزێتە" و "ئاق بابا" و "ئەقشام" و گەلێکی تردا کە هی وایان تێدا بوو بە دەیان هەزار دانەیان لێ چاپ دەکرا. "ئەقشام" (شەو) کە لە ساڵی 1918ەوە لە ئەستەنبوڵ دەردەچێ و بێ لایەنە دەمێك ساڵە پتر لە صەد و پەنجا هەزار دانەی لێ بڵاو دەبێتەوە.
ئەمە بۆ خۆی بووە هۆیەکی تری زیاتر پێناسینی عەزیز نەسین بە خوێندەوارانی تورکیا. لەسەرەتای سەشتەکانەوە بۆ خۆی کەوتە دەرکردنی گۆزاری "زەبوق". (دار جگەرە یان قەندە).
کاربەدەستی بچوکی بێ لانە، رووناکبیری بەدبەختی بێ چارە، هەژاری قوڕ بەسەر، ئەو بێ کارانەی بۆ پارووە نانێك وەك سەگی چەقاوەسوو بە ناچاری سەر بە هەموو کونێکدا دەکەن. دوورخراوەی سیاسی، بەندی بێ تاوان، لەگەڵ وڕکنی قڕوتاوەی چاوبرسی و زۆڵی حەرامزادەی مەرایی کەر و هەلپەرستی بێ مەزەب و نەفامی پفدراوی خۆ بەشت زان و بەرتیل خۆری بێ ویژدان قارەمانی سەرەکی ی بەرهەمەکانی عەزیز نەسینن. تایبەت کورتە چیرۆك و رۆمان و شانۆنامەکانی. بێ پەروا باسی شا و گەدا دەکات و هەر کەسێ هەڵگرێ بە خامەی رەنگینی گاڵتەی پێ دەکات و دەیکاتە بووکەسەماکەرە و با لەسەر کاغەزیش بێ تۆڵەی بەر و دوای کۆمەڵی لێ دەسێنێ. هەمووش بە پەرۆشەوە نووسینەکانی دەخوێننەوە و بە ئاسانی لە زمانی پاراو و رەوانی بێ سەر و بۆر و پێچ و پەنای تێ دەگەن و وەك خۆی دەیەوێ تا چاویان پڕ دەبێ لە فرمێسك بە قارەمانانی چیرۆك و شانۆنامەکانی پێ دەکەنن. لە خۆڕایی نی یە نازناوی "مەلای مەزبوورەی سەدەی بیستەمین" ی پێ دراوە.
"هەر بژی هەژاری" "شێتە پەتەڕی یەکان" "کام حیزب سەردەکەوێ" "شەڕە کورسی" "فس فس پاڵەوان" "بزنسمین"، "گێلە پیاو"، "ئافەرین"، "کەری تۆپیو" ئەمانەیش نموونەی ناونیشانی چیرۆکەکانین کە مۆرکی رەخنەی توند و تیژی رژێمی سیاسی و زوڵمی کۆمەڵایەتی یان پێوە ئاشکرایە.
بە هۆی ئەو جۆرە بەرهەمانەیەوە عەزیز نەسین، وەکو جۆزێف ناشف دەڵێت:"بۆتە یەکێك لەو ناودارانەی سەدەی بیستەم کە تێکەڵ بە جیهانی ئەدەب بوون. ئەویش نەك تەنها لەبەر ئەوەی بلیمەتن بەڵکو لەبەر ئەوەیش کە بە لایانەوە ئەدەب و هونەر چەکێکی کاریگەری کۆڕی خەباتن." (بڕوانە: من المسرح العالمي/ الكويت، العدد 197 اول فبراير 1986 ص 5).
لە ساڵی 1956 ەوە عەزیز نەسین تەواو ناو و شۆرەتی دەرکرد. ئەو ساڵە خەڵاتی یەکەمی پێشبڕکێی گەپنووسی (ساتیری) وەرگرت کە هەموو ساڵێك لە ئیتاڵیا ساز دەکرێت. بۆ ساڵی داهاتوو دیسان هەمان خەڵاتی بەرزی وەرگرتەوە. لەوساوە خوێنەرانی زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکان کەوتنە سۆراخی بەرهەمی ئەم چیرۆکنووسە بلیمەتە.
تا ئێستا بە کوردیی ئازیزی خۆمانەوە بەرهەمەکانی وەرگێڕدراونەتە سەر پتر لە بیست زمانی وەك ئینگلیزی و فەرەنسی و روسی و ئەڵەمانی و ئیتاڵی و عەرەبی و ئازەری و فارسی و چینی و بەلگاری و رۆمانی و گەلێکی تر. وەك دەگێڕنەوە ئەو هۆڵەی ساڵی 1964 لە کالیفۆرنیای وڵاتە یەکگرتووەکان یەکێك لە شانۆنامەکانی پێشکەش کرد، لەبەر لێشاوی بینەران جمەی دەهات.

ئەمانە هێندەی تر پیتیان دایە بەرهەمە نازدارەکانی عەزیز نەسین. لە ماوەی تەنها هەشت ساڵدا دوای وەرگرتنی خەڵاتی یەکەم، واتە لە ساڵی 1956ەوە تاوەکو ساڵی 1964 عەزیز نەسین چوار رۆمانی گەورە و سی و پێنج کۆمەڵە چیرۆکی دەرکرد، کە بەسەر یەکەوە دەکاتە سی و نۆ کتێب. واتە، ماڵی خامەی ئاوا، ژمارەی ئەو کتێبانەی لە ساڵێکدا تەنها لەو ماوەیەدا دەری کردوون لە چوار تێپەڕ دەکات. پاش سێ ساڵی تر ژمارەی کتێبەکانی گەیشتنە پەنجاو سێ. ژمارەی ئەو کۆمەڵە چیرۆك و رۆمان و شانۆنامانەی تا ئیمساڵ چاپی کردوون گەیشتۆتە هەشتا و نۆ. بەڵی هەشتا و نۆ، دیسان ماڵی خامەی هەزار جار ئاوا.

نووسەرێکی وا گەورەی چەسپاو لە ناخی دەروونی رۆوناکبیرانی تورکیا و جیهاندا دەبوو جێگەی رەوا و شیاوی خۆی لە دەزگا ئەدەبی یە بەرزەکاندا بدرێتێ.

شەش دانە ساڵە لەسەر یەك سەرۆکی راستەقینەی یەکیەتی نووسەرانی تورکیایە. واتە لە سێ هەڵبژاردنی یەك لە دوای یەکدا بێ هیچ دەست تێوەردانێك بۆ ئەو شوێنە هەڵبژێردراوە. هەمان کات ئەندامی دەستەی کارگێڕی یەکیەتی نووسەرانی ئاسیا و ئافەریقا و یاریدەدەری سکرتێری گشتی ئەو یەکیەتییە یە.

بێگومان گەورە پیاوێکی وەك عەزیز نەسین لە هەموو دڵ و چاو و دەروونێکی خاوێندا جێگەی دەبێتەوە تەنها لای زۆرداران نەبێ کە ئەفسوس وا دیارە لە دڵ و چاو و دەروون بێ بەرین بۆیەکا لە خۆیان بەو لاوە کەسیان خۆش ناوێ. لەبەر ئەوە وەك د. ئیبراهیم داقوقی دەڵێ:"تورکیا رژێمێکی بەخۆیەوە نەدی عەزیز نەسین نەگرێ، یا راوەدووی نەنێ و دووری نەخاتەوە." (بڕوانە: من المسرح العالمی/ الکویت، العدد 196 اول ینایر 1986 ص 23).

ساڵی 1946 عەزیز نەسین لە وتارێکی کورتدا داوای کرد بە هۆی قەرزەوە "نیشتمانی ئازیز" نەکرێتە خۆراکی "ملیاردێرانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا"، لەسەر "ئەو کفرە گەورەیە" بۆ ماوەیەك ئاخنرایە زیندانەوە. عەدنان مەندەرێسی سەرەك وەزیران هەرچەندە گەلێك شەیدای نووسینەکانی عەزیز نەسین بوو کەچی ئەیلولی ساڵی 1952 فەرمانی گرتنی دەرکرد.

کە بیست و حەوتی مایسی (مانگی پێنج/ ...) ساڵی 1960 بە هاندانی دەستەیەك ئەفسەری خوێن گەرم جەنەراڵ جەمال گۆرسێل رژێمی جەلال بایار - عەدنان مەندەرەسی سەر بە رۆژئاوای روخاند، عەزیز نەسین بە گەورەیی پێشوازیی رژێمی نوێی کرد و لە خۆشی یانا خەڵاتە زێرنەکانی خۆی پێشکەش رابەرانی کرد. هەرچەندە کۆدێتای ساڵی 1960 هەنگاوێکی سیاسی بوو بۆ پێشەوە، بەڵام بەر لەوەی بگاتە نیوەی رێ لە بەڵێن و پەیمانە زۆرەکانی پاشگەز بۆوە. بۆیەکا هیچ سەیر نەبوو عزیز نەسینی رۆڵەی بە وەفای گەل و خاکی نیشتمان لەسەر چەوساوان ببێتە یەکێك لە نەویستانی حکومەتی "یەکیەتی نیشتمانی" گۆرسێل. عزیز نەسین دیسان لە بەندیخانە توند کرایەوە.

بۆ خۆی بە تەوسەوە باسی ئەو گرتنانەی دەکات و دەڵێ:"پێش ئەوەی بچمە بەندیخانە پیاوێکی لەڕ و لاواز بووم، بەڵام لەبەر ئەوەی لە بەندیخانەدا کارم تەنها خواردن و خەوتن بوو زوو قەڵەو بووم." لەبەر ئەوەی خۆشەبەختانە رژێمی سیاسی تورکیا بەرەو لیبرالیزمی رۆژئاوایی دەڕوات دەمێکە شوکور راوودوونانی عەزیز نەسین لە مەترسی تواندنەوە و سەرەونگوم کردن قوتار بووە. جاری وا هەیە لە مەیانی دادوەریدا دەنگی ئەو بەسەر دەنگی رژێمدا زاڵ دەبێ. ساڵی 1967 عەزیز نەسین دوای گەڕانەوەی لە کۆنگرەیەکی ئەدەبی جیهانی کۆمەڵێك شیعری نازیم حیکمەتی لەگەڵ خۆیدا هێنابۆوە، بۆ ئەوەی لە تورکیا لە چاپیان بدات. لەسەر ئەوە لە فڕۆکەخانەوە راپێچ کرایەوە، بەڵام "دادگەی رۆژنامەنووسی" کە ئەندامانی ژمارەیەك دادوەر و رۆژنامەنووسی

بەناوبانگن، بڕیاری بەردانی عەزیز نەسین و چاپکردنی شیعرەکانی نازیم حیکمەتی دا. چونکە بە پێی یاسای یۆنسکۆ نابێ هیچ بەرهەمێکی روناکبیری قەدەغە بکرێ. هەزاران چەپکە گوڵی رازاوە بۆ یاسا و بڕیاری وا کە بێ بەرییان لە هەر کەس زیاتر لە تام و لەزەتی بێ ئەندازەی تێدەگەن.

وا دیارە ئەوانە سەرڕاست و خاوەن هەست و بیری رەسەنی راستەقینەن لە هەر چوار لاوە تیر و توانجی ناڕەوایان تێدەگیرێ. لەم بارەیەوە قسەکانی دکتۆر ئیبراهیم داقوقی دەربارەی عەزیز نەسین دێنینەوە، داقوقی دەڵێ: (ئەوەی دەربارەی دەگوترێ وا لە پیاو دەکات لە قاقای پێکەنیندا بەسەر گازی پشتدا بکەوێ. کەساڵی 1950 "ئەم وڵاتە وڵاتی ئێمەیە"ی نازیم حیکمەتی لە گۆڤاری "یاشدان"دا بڵاوکردەوە، پارتی کۆمۆنیستی تورکیا تۆمەتی سیخوڕی دایە پاڵ. کەچی هەمان کات پۆلیسی تورکیا بە پیاوی رووس و ئەندامەتی پارتی کۆمۆنیستی تورکی ی نهێنی لە قەڵەم دا و لەسەر ئەوە چەند ساڵێك دووچاری بەندی و دەربەدەری کرد. راستڕەو و پیاوە ئاینییەکان دەڵێن زەندیق و ماسۆنییە، لە رێگە نووسین و چیرۆکە کورتەکانییەوە بیر و باوەڕی مارکسی بڵاو دەکاتەوە. "هەمان سەرچاوە ل 24-25").

لە سایەی راستییەوە بەشی یەکەمی ئەو بۆچوونە چەپەڵە لەگەڵ دروشمی ستالینیی چەپڕەوی "ئەوی لەگەڵم نییە دوژمنمە" گۆڕ بە گۆڕ بوو، بۆیەکا دەمێ ساڵە نووسەر هەرە پێشکەوتووخوازەکانی تورکیا عەزیز نەسین بە "سامانی نەتەوەیی" هەموو وڵات دادەنێن و هەموو کات ئەو نووسەرە کۆنخوازانەی بە خوێنی سەری چەپڕەوگەری تینوون، ئێستە دەڵێن سێ دەستەن ئەوانەی عەزیز نەسینیان بە دڵ خۆش دەوێ: "کەس و کاری، سەرانسەری گەلی تورك و کاربەدەستانی ئەمن و موخابەرات" بڕوا ناکەم مەسیحیش بەو رادەیە خۆشەویست بووبێ. ئەو خۆشەویستییە دەگمەنە پڕ بە پێستی نووسەری هەڵکەوتووە. نەك تەنها ئەدیب و رۆژنامەنووسانی خۆ و بێگانە تامەزرۆی بینینی عەزیز نەسینن، بەڵکو بینینێکی وا بۆتە ئاواتی سەرجەمی خوێنەرانی تورکیا. لاوی خوێن گەرمی ئەوتۆ هەیە بە سەدان کیلۆمەتر رێگە دەبڕێ هەر بۆ ئەوەی بە دیداری شاد بێ و وێنەیەکی لەگەڵ بگرێ یان بەرهەمەکانی خۆی بۆ دەبات بە خەتی خۆی پێشکەشیانی بکات. یان بۆ راوێژ و رێ نیشاندان. نووسین لەسەر کەڵە پیاوێکی وەك عەزیز نەسین ئاو زۆر دەکێشێ چونکە هەموو رەفتار و لایەنەکانی ژیانی شایانی باس و پیا هەڵدانن. "بێکەسخانەی عەزیز نەسین" کە بەشی داهاتووی ئەم وتارەی بۆ تەرخان دەکەین، یەکێکە لەو شتە هەرە بەرزە دەگمەنە سەیرانەی ئەم دونیایە.

**عەزیز نەسین**

## نووسەری گەورە و مرۆڤی کەم هاوتا و دۆستی نزیکی گەلی کورد

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد

**بەشی دووەم**

(**رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە** 1122**، رۆژی** 1989/10/30**، ل** 10)

پیاوێکی بێ ئەندازە گەورەی وەك عەزیز نەسین دەبێ خاوەن هەست و بیر و دڵێکی سەیر و بێ وێنە بێ و خەیاڵی بەرزی تەنها بەلای کار و کرداری مرۆڤانەی بێ هاوتادا بشکێتەوە. بەرهەمەکانی عەزیز نەسین لە هەموو لاوە دەڤۆزرێنەوە و وەردەگێڕدرێنە سەر زمانی تر و لەسەر شانۆ نیشان دەدەرێن. بۆیەکا دەمێك ساڵە بۆتە خاوەن داهاتێکی گەورە. هەڵبەت دانایەکی وەك ئەو باش لە نرخی راستەڤینەی پارە و پوول گەیشتووە، بۆیەکا سۆراخی پارە پێکەوە نان نییە. ئاغا و سەروەری پارەیە نەك عەبدی. بۆچوون و تێگەیشتنی وا دروست و دووربین بووە هەوێنی پرۆژەیەکی مرۆڤانەی بێ هاوتا لە بیر و مێشکی نووسەری گەورەدا. عەزیز نەسین بڕیاریدا ئەو سامانەی هەیەتی بۆ کارێکی وای تەرخان بکات بە بیری کەسدا نەهاتبێ. لە ساڵی 1972ەوە کەوتە خۆ بۆ جێبەجێ کردنی ئەو پرۆژەیەی کە پێم وایە لای هەموو فامدارێك گەلێك لە کەنشتە و کڵێسە پیرۆزتر وئەجر و نرخی لای خواوەندی گەورە زۆرترە. لە ناوچەی رازاوەی چەتاڵجە، کە یەك دوو سەعات لەو لای ئەستەنبوڵەوەیە، لەسەر دەریا عەزیز نەسین پێنج دۆنم زەوی کڕی و لە ناوەندیا کۆشکێکی گەورەی بە ساردادوە چوار نهۆمی دروست کرد. ئەوەی تری کردە کێڵگە و بێستان و لەوەڕگەی گا و مانگا و شوێنی بەخێوکردنی پەلەوەر و بەرهەمهێنانی هێلکە. سارداوی کۆشکەکەی کردە شانۆیەکی خنجیلانە و هۆڵێکی سینەما. نهۆمی یەکەمی بەسەر دوو کتێبخانەدا دابەش کرد. یەکەمیان کتێبخانەی تایبەتی خۆی و دووەمیان کتێبخانەیەك بۆ منداڵان، نهۆمی دووەمی کردە شوێنی خزمەت و چێشتخانە و ژووری نان خواردن. لە نهۆمی سێیەمیشدا چەند ژوورێکی نووستنی دروست کرد. تەواوکردنی ئەو کارانە دەوروبەری شەش ساڵی خایاند. ئینجا عەزیز نەسین لە ساڵی 1978ەوە کەوتە سۆراخی ئەو هەتیوانەی نە دایك، نە باوك، نەکەسێکیان هەیە دالدەیان بدات. هەر ساڵەی چوار کەساسی بێ چارەی وای وەرگرت تا ژمارەیان گەیشتە بیست و پێنج کەس. بەسەرپەرشتی خۆی ئەو منداڵانە بە ئەوپەڕی ئاسوودەیی، تێر و تەسەل، پۆشتە و پەرداخ پەروەردە دەکرێن تا خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و زانکۆ تەواو دەکەن. کامیان زیرەك و بلیمەت دەرچێ عەزیز نەسین خوێندنی باڵای لە تورکیا یان لە ئەوروپا پێ تەواو دەکات. ئێستە دوو ئەندامی "بێکەس خانەی عەزیز نەسین" لە زانکۆ دەخوێنن. ئەوانی تریان لە باخچەی ساوایان و ڤوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندین. هەر کامێك لەو بیست و پێنجە پێگەیشت ئیتر ژیانی سەربەخۆی خۆی دەست پێدەکات و بێکەسێکی تر جێگەی دەگرێتەوە کە مەرج نییە هەر تورك، یان تەنها تورکیایی بێ. یەکێك لە ئەندامانی "بێکەسخانەی عەزیز نەسین" منداڵێکی بێ لانەی ئەڵەمانی یە.

خەرجی مانگانەی "بێکەسخانەی عەزیز نەسین" پێنج ملیۆن لیرەی تورکی یە، کە بە پێی گۆڕینەوەی ئێستە دەکاتە بیست و پێنج هەزار دۆلار. بەهەموو سەنگ و پێودانێك ئەو پارەیە یەکجار زۆرە، تایبەت بۆ بارودۆخی

ئەمڕۆکەی تورکیا. بێگومان "بێکەسخانەی عەزیز نەسین" بەرزترین و بەختەوەرترین خێزانی ئەم جیهانەیە. ئەندامانی بە هۆی نووسەری گەورەوە لە هەر کەس کەسدارترن. عەزیز نەسین بۆ خۆی سەرپەرشتی هەموو کارێکیان دەکات، خوێندنیان، خواردنیان، تەندروستیان، رەفتاری رۆژانەیان، وەرزشیان، کاری هەرەوەزی یان، هەموو ژیانی لەگەڵیان دەباتە سەر. هەر لەوێش بەرهەمە شاکارەکانی دەنووسێ و پێشوازی میوانەکانی دەکات کە جگە لە وەزیر و گزیر هی وایان تێدایە مامۆستا یان رۆژنامەنووسی بە ناوبانگی تورکیا و دەرەوەی تورکیایە. ئەوانەی "بێکەسخانەی عەزیز نەسین" یان دیوە بە تایبەتی باسی پاکژی و خاوێنی دەکەن. کەس بۆی نییە بە پێلاوەوە پێ بنێتە ناو هۆڵ و ژووره رێك و پێکەکانییەوە. کەسدارە بەختەوەرەکانی شانازی بە عەزیز نەسینی باوکیانەوە دەکەن و بە دەستوری بنەماڵەی موتاپچی لای خۆمان هەر بە "بابەگیان" بانگی دەکەن و ناوی دێنن. دیارە ئەویش روحی بەسەریانەوە دەردەچێت. لە دایك و باوکی راستەقینە بە پەرۆشترە بۆیان. تا ئێستەیش بە قورگی پڕ لە گریانەوە باسی ئەو دوو زاڕۆڵەیەی دەکات کە ماوەیەك لەمەوبەر بەداخەوە لە کاتی مەلەدا خنکاون. وێڕای زیرەکی و تێگەیشتنی راستی ژیان و نرخاندنی دروستی سامان، بێگومان یادی باری سەختی ژیانی هەژاریی خۆی و براکانی لە هەرەتی منداڵیدا لە ناخی دەروونی چەسپیوە و بە "لا شعور" کردوویەتە بێکەس پەرست. بۆ خۆی کاتێك پوختەی سەرگوزشتەی ژیانی دەگێڕێتەوە، دەڵێ:

"ئەگەر بۆتان باس بکەم چۆن چوار برام لە بەرانبەر برسیەتی و تینویەتیدا بە چۆکدا هاتن و یەك لە دوا یەك خواحافیزیان لەم جیهانە کرد، تێدەگەن کە من لە ژیاندا چەند گیان سەختم". ئەو گیان سەختی یە وای لە عەزیز نەسین کرد چ بە نووسین چ بە کردار هەموو توانا و دەسەڵاتی خۆی بۆ بەختەوەری و گیان نا سەختی خەڵکی تەرخان بکات. بۆ خۆی بەم جۆرە پەیوەندی ئەو گیان سەختی و ئەو ئارەزووی بەختیارکردنی کەسانی تره پێکەوە دەبەستێ و دەفەرموێ:

"بۆ هەر کوێ دەچم ئەو دۆزەخەی لە دەروونمدا قوڵپ دەدات لەتەك خۆمدا دەیبەم. هەرچەندە هەموو شتێکم هەیە و لە هیچم کەم نییە، بەڵام لە ئاسودەیی و دڵنیایی بێ بەریم. بە هەموو توانامەوە لە رێگەی نووسین و کردارمەوە هەوڵم داوە هەمووان بەختەوەر بکەم." لەگەڵ ئەوەشدا نە دەشێ، نە دەبێ عەزیز نەسینی مرۆڤی کەم هاوتا لە ژیان بێ هودە بێ و بڵێ: "بڕوام پێ بکەن گەلێك جار حەز دەکەم بمرم. دەزانن بۆچی؟ چونکە دەمەوێ بحەوێمەوە." دیارە دوعای خێری بێکەسان بۆتە پەرژینی دەوری ئەو پیاوە گەورەیە بۆیەکا یەزدان دەستی بە بالێی یەوە گرتووە و شوکور تەمەنی درێژ کردووە. ئەوی خاوەنی بێکەسخانەیەکی وەکو بێکەسخانەکەی ئەو بێ پێویستە لە هەر کەس زیاتر حەزی لە ژیان بێ، ژیانێکی واش کە بۆ خەڵکە نەك بۆ خۆی. "بێکەسخانەی عەزیز نەسین" کرداری دوو نووسەری گەورەی جیهان دێنێتەوە یاد. یەکەمیان "یۆتۆپیا" بە ناوبانگەکەی تۆماس مۆری ئینگلیزی (1478-1535) کە بریتی بوو لە کۆمەڵگایەکی یەکسانی بەختەوەر. بەڵام لە جیهانی خەیاڵ و دووتوێی کتێبدا. پێم وایە دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین عەزیز نەسین دوای نزیکەی پێنج سەد ساڵ بەکردەوە یەکێك لە ئاواتە بەرزەکانی تۆماس مۆری نەمری هێنایە دی. دووەمیان نووسەری گەورەی رووس و جیهان لێف تۆلستۆی (1828-1910) کە لە بنەماڵەیەکی زەویداری دەوڵەمەند و ناسراو بوو. تۆلستۆی ویستی ئەو زەوی و زارەی لە باپیرانییەوە بۆی ماوەتەوە، هەموو بەسەر جوتیارە نیمچە کۆیلەکانی یاسنەیا پەلیانادا دابەش بکات. کە خێزانی رێگەی ئەو کارەی نەدا بڕیاری دا هەموو بەرهەمەکانی بکاتە موڵکی موفتی خوێنەران بەوەی پولێك لە بلاوکردنەوەیان وەرنەگرێ. تۆلستۆی ئەو بڕیارەی لە رۆژنامەکانی ئەوسای

رووسیادا بلاوکردەوە. تۆماس مۆری ئینگلیز و لێف تۆلستۆی رووسی و عەزیز نەسینی تورك وەك یەك عەودالی بەشینەوەی تاجەگوڵینەی بەختەوەرین بەسەر هەموو کەساسانی جیهاندا.

"بێکەسخانەی عەزیز نەسین" بۆی هەیە کۆتەڵی خۆشەویستی و قەدر و رێزی زۆر لە دڵی هەموو دڵسۆزێکی ئەم جیهانەدا بۆ نووسەری گەورە هەڵبەستێ. پێشم وایە کەس وەك بێکەسی کورد لە قەدری بەرزی بێکەسخانەکەی عەزیز نەسین تێ ناگات. کە وەك لە کۆتایی بەشی یەکەمدا گوتمان، یەکێکە لەو شتە هەرە بەرزە سەیرانەی ئەم دونیایە. بێکەس بمایە رازاوەترین هۆنراوەی ژیانی بۆ دەگوت. بریا لە جیهاندا هەزاران عەزیز نەسینمان دەبوو تا برینی دەرد و ئازاری بێکەسان سارێژ دەبوو.

زۆر سەیر دەبوو مرۆڤێکی کەم هاوتای وەك ئەم عەزیز نەسینە ئاوڕ لە کورد نەداتەوە. ئەو باسەی خوا یار بێ دوا بەشی ئەم زنجیرە وتارەی بۆ تەرخان و چاوی خوێنەری ئازیزی کوردی پێ روون و دڵی پێ خۆش دەکەین.

کۆشکی "بێکەسخانەی عەزیز نەسین" کە خۆی ناوی "وەقفی عەزیز نەسین"ی لێ ناوە، سێ بەختەوەری کەسداری "بێکەسخانەی عەزیز نەسین".

.....

عەزیز نەسین

## نووسەری گەورە و مرۆڤی کەم هاوتا و دۆستی نزیکی گەلی کورد

**د. کەمال مەزهەر ئەحمەد**

**بەشی سێیەم**

(رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە 1123، رۆژی 1989/11/2، ل 6)

راستە لە سەرانسەری هەموو جیهاندا مرۆڤێکی رێك و پێك هەڵناکەوێ لە قولایی دڵەوە رِقی لە جەور و ستەم و زۆردار و زۆرداری نەبێت، بەڵام رەنگبێ شەپۆلی رەوای ئەو رِقە پیرۆزە لە دەروونی کەسدا بە رادەی عەزیز نەسین پەنگی نەخواردبێتەوە.

بە نووسین و رِەفتارەکانیدا بە ئاشکرا دیارە تا چ رادەیەك قێزی لە زاڵم و زۆردار دێتەوە. ئەو رِق و قێزە لای عەزیز نەسین سنوور برِە. وەك یەك نەفرەت لە زۆرداری خۆ و بیانی دەکات. لە پای کنوزی هەموو دنیادا بێزی نایە بە شانوباهوی هیچ زۆردارێکدا هەڵدات. لە چلەکاندا (سەدەی بیست/ ئامادەکاران) شەش مانگان لەسەر فاروقی پاشای میسر و فەرمانرِەوایەکی زۆرداری تر خرایە زیندانەوە.

عەزیز نەسین کابرایەکی کورتە بنەی تێکسمرِاوە. دوای دەرچوونی یەکێك لەو شانۆنامانەی کە هەموو گاڵتەپێکردن و تیزەجارِییە بە زۆردارە لە خۆبایی بووەکان رۆژنامەنووسێکی تورك لە وتارێکیدا دەربارەی شانۆنامەکە نووسیبووی، دەڵێ:"ئەو عەزیز نەسینە بستە باڵایە هەموو زۆردارانی جیهانی گێژ کردووە."

ئەم هەڵوەستە دروستەی نووسەری گەورە لە باوەرِی قوڵی بە مافی رەوای ئازادی مرۆڤ هەڵقوڵاوە. بۆیەکا ئەو بە هەست و بە گیان لەگەڵ هەموو زۆرلێکراوێکی ئەم جیهانەیە بێ ئەوەی گوێ بداتە، یا بیروباوەرِ و پایە و مەقامی. ئەوەی عەزیز نەسینی کردۆتە دروشمی سەربەستی بیر و را لە تورکیا و نمونەی نووسەری مرۆڤپەروەری خەباتگێرِ لە جیهاندا. ." (برِوانە،4 من المسرح العالمی/ الکویت، العدد 196 اول ینایر 1986 ص 25).

لەم فوژبنەوە عەزیز نەسین سەیری کێشەی گەلان و فورِبەسەری لێقەوماوان بە دەست زۆردارانەوە دەکات. نووسەرێکی عەرەب دوای دیدەنییەك لەگەڵی نووسیویە، دەڵێ: (لە گفتوگۆوە لەگەڵی بۆم دەرکەوت ئەم نووسەرە باش ئاگاداری ئەدەبی نیشتمانی عەرەب و ئەو کێشە سەرەکیانەیە کە نەتەوەی عەرەب دووچاری هاتوون...) "هەمان سەرچاوە ژمارە 197، 1.2.1986 لاپەرِە 5-6).

هەر بەو جۆرەش نووسەری گەورە و سەروەر ئاگاداری دەرد و ئازاری دێرینی گەلی کوردە. جارێکیان میوانێکی کورد پێی دەڵێ: خوێنەرانی کورد بە رادەیەك خۆشیان دەوێیت، لایان بویتە کورد. لە وەڵامدا فەرموویە:"من کورد نیم، بەڵام لەبەر ئەوەی مرۆپەروەرم گەلانی هەموو جیهانم خۆش دەوێت، تایبەت زۆرلێکراوانیان."

زۆر جێگەی داخ و سەرزەنشتی دەبوو ئەگەر عەزیز نەسینی گەورە ئاگاداری دەرد و ئازاری نزیکترین گەلی وەڵاتەکەی خۆی نەبێ کە بەداخەوە زۆر زۆری بەدەست عوسمانی و کەمالیەکانەوە چێشتووە، هەرچەندە کۆڵەگەیەکی گەورەی رژێمی هەردوو لایان بوو. ئێمە هەمیشە گلەیی ئەوە لە نازیم حیکمەتی بە ناوبانگ و نووسەرە پێشکەوتخوازەکانی تورکیا دەکەین کە دەرد و ئازاری بێ ئەندازەی برا کوردەکانیان جارێك نەیبزواندوون. هەرچەندە ئەو دەرد و ئازارە کێو لە بن دێنێ. نازیم حیکمەتی خوالێخۆشبوو بە کوڵ بۆ رەش

پێستانی ئەمەریکا و زۆرلێکراوانی هەر چوار گۆشەی جیهان دەگریا، لە کاتێکدا ژیانی زۆربەیان گەلێك لە ژیانی کوردی تورکیا باشتر بوو. با ئەوەیش لە یاد نەکەین کە دەرفەتی نازیم حیکمەت بۆ بزواندنی ئەو جۆرە باسانە گەلێك لە دەرفەتی عەزیز نەسین لە بار و زیاتر بوو. چونکە ئەویان بەشی زۆری ژیانی لە دەرەوەی وڵات بردە سەر و لە زۆر لاوە و بە گەلێك زمان دەرگەی بڵاوکردنەوەی بۆ ئاوەڵە کرابوو بێ ئەوەی لە گرتن و راوەدوونان بترسێ. عەزیز نەسین هەڵوەستێکی مێژوویی گەورەی هەیە بەرانبەر بە کورد. هەڵوەستێك کە هەر لەو نووسەرە گەورە مرۆپەروەرە دێ. "گۆڤاری بەرەو ساڵی دوو هەزار" کە بە تورکی لە ئەستەنبوڵ دەردەچێ و بە گۆڤارێکی پێشکەتخواز ناوی دەرکردووە لە دیدەنی یەکی تایبەتیدا داوای بیروڕای عەزیز نەسینی دەربارەی مەسەلەی کوردی تورکیا کردووە، گۆڤاری ناوبراو لە ژمارەی رۆژی نۆی ئابی (ئاوگوستۆس) ساڵی 1987یدا وەڵامی عەزیز نەسین بڵاوکردۆتەوە کە هەمووی لایەنگری بووە بۆ گەلی کورد.

دیارە کاربەدەستان فەرمایشتە ڕەواکانی عەزیز نەسینیان بە دڵ نەبوو، لەبەر ئەوە یەکسەر فەرمانی کۆکردنەوەی هەموو ئەو ژمارانەی گۆڤاری "بەرەو ساڵی دوو هەزار"یان دەرکرد و هەمان کات عەزیز نەسینیان دایە دادگە.

ئەم کارە هەموو تورکیای هەژاند، تایبەت روناکبیران و سیاسی یانی و لە هەمووانیش زیاتر دەستە و دایەرەی پێشکەوتوخوازەکانی و مرۆپەروەرەکانی. هەژدە پارێزەر بە جارێك خۆیان بۆ بەرگری لە عەزیز نەسین ناونووس کرد. ئەنجام دادگە نەك هەر بڕیاری بێ تاوانیی عەزیز نەسینی دەرکرد، بەڵکو وێڕای ئەوە بڕیاریشی دا ژمارە کۆکراوەکانی گۆڤاری "بەرەو ساڵی دوو هەزار" بدرێتەوە دەستەی بەڕێوەبەری بۆی ئەوەی دیسان بیانخاتەوە بازاڕ. ئەمانیش، هەزارجار ئافەرین، ئەو ژمارەیەی گۆڤارەکەیان بە بەرگێکی نوێوە بڵاوکردەوە، کە ئەم ڕستەیەیان خستە سەر "وێنەی بەرگی ئەو ژمارەیەی بە پێی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی دەوڵەت قەدەغەکرا". ئەمە هێندەی تر سەرنجی خوێنەرانی راکێشا.

هەڵوێستی عەزیز نەسین و بڕیاری دادگە سەرکەوتنێکی بۆ ژیانی دیمۆکراسی تورکیا، کە وەك گوتمان، خۆشبەختانە بەرەو لیبرالیزمی ئەوروپایی دەچێت.

هەر ئەوەیش بۆ خۆی بووە هاندەرێکی تر بۆ ئەوەی گۆڤاری "بەرەو ساڵی دوو هەزار" دەست هەڵنەگرێ. دیسان کەوتەوە سۆراخی بیروڕای نووسەران و مامۆستایان و دادوەران و ناسراوانی تری وڵات دەربارەی هەمان مەسەلە.

زۆری نەبرد گۆڤاری "بەرەو ساڵی دوو هەزار" هەنگاوێکی گەورەتری نا. ئەمجارەیان بەڵگەنامەیەکی مێژوویی یەکجار بایەخدار و گرنگی مستەفا کەمال ئەتاتورکی دەربارەی کوردی بڵاوکردەوە.

کەمالییەکان لە کۆڕی خەباتی سەختی نەتەوەیی-رزگاریخوای گەلدا تا ئەیلولی ساڵی 1922 توانییان بە تەواوی بەسەر لەشکری یۆنانی داگیرکەردا زاڵ ببن و هەموو خاکی ئەنەدۆڵیان لێ پاك بکەنەوە. شەوی شازدە لەسەر حەڤدەی کانوونی دووەمی ساڵی 1339ی رۆمی کە دەکاتە 1923ی زاینی مستەفا کەمال پاشا بەو بۆنەیەوە لەگەڵ رۆژنامەنووسانی ئیستەنبوڵ لە شاری ئیزمیتی ئازاد کراو لە چنگی یۆنانییەکان کۆبۆوە.

لەو کۆبوونەوەیەدا کە تا سەعات سێی بەرەبەیانی رۆژی حەڤدەی کانونی دووەمی خایاند، مستەفا کەمال داوای لە هاتووان کرد، هەر پرسیارێکیان هەیە بێ پەروا و سڵ بیکەن. ئەحمەد ئەمین یەلمانی نووسەر و سیاسی و مێژووزان و رۆژنامەنووسی بەناوبانگ دەربارەی مەسەلەی کوردی پرسیاری لێدەکات. لە وەڵامدا مستەفا کەمال باسی نزیکی و هاوچارەنووسی تورك و کورد دەکات و دەڵێت، نیاز وایە بە پێی یاسای کارگێڕی بنەڕەتی خودرموختاری بدرێت بە ناوچە کوردەوارییەکان.

سەرجەمی پرسیاری رۆژنامەنووسان و وەڵامی مستەفا کەمال لەو کۆبوونەوەیەدا کراوەتە راپۆرتێکی شازدە لاپەڕیی کە بە دەستخەت نووسراوەتەوە. دەقی ئەو راپۆرتە لە ئەرشیفی گۆڕی ئەتاتورك لە ئەنقەرە هەڵگیراوە. جگە لە چەند وێنەیەکی کە لە کتێبخانەی "کۆڕی مێژوویی تورکی" و ئەرشیفی سەرکردایەتی لەشکر هەڵگیراون.

ئەو شۆڤێنیانەی دژی مافی رەوای کوردن بوون بە هۆی سەرەونگوم کردنی ئەم بەڵگەنامە گرنگە تا گۆڤاری "بەرەو ساڵی دوو هەزار" لە ژمارەی رۆژی شەشی تشرینی دووەمی ساڵی 1988یدا پەردەی لەسەر هەڵماڵی و بە گەورەیی دەقی بە رێنووسی کۆن و بەرانبەر بە لاتینی نوێ بڵاوکردەوە. جگە لەوەی بە نیازی سەرنجڕاکێشانی زیاتر بەرگی ئەو ژمارەیەی بۆ ئەو باسە تەرخان کرد و بە وێنەیەکی گەورەی مستەفا کەمال و سەردارێکی کوردی لایەنگری رازندییەوە کە پشتێنەی وێنەکەیش بریتییە لە زەنگۆگرافی چەند بەشێکی دەقی بەڵگەنامەکە خۆی لەسەرەوەی بەرگی دەرەوەی بە گەورەیی نووسراوە (بەڵگەنامەی شاردراوە). لە دامێنیشیدا بە پیتی گەورەتر نووسراوە (ئۆتۆنۆمی بۆ کورد).

ئەم کارەی گۆڤاری "بەرەو ساڵی دوو هەزار" بووە هۆی تەقینەوەیەکی گەورە لە ناو ڕیزەکانی ڕای گشتی سەرانسەری تورکیادا. دوور نییە هەر ئەوەیش بۆ خۆی عەزیز نەسینی زیاتر هاندابێ بۆ نانی هەنگاوی بایەخداری داهاتووی لە هەڵوێستی مرۆڤانەیدا بەرانبەر بە کورد.

نووسەری گەورە و سەروەر ئەمجارەیان کتێبێکی سەربەخۆی بۆ کورد و بەشێك لە هاوڕەگەزانی خۆی تەرخان کرد، کە هەزار جار ئەفسوس، چارەنووسیان لە چەند روویەکەوە لە چارەنووسی کوردی تورکیا دەکات. بە قەوارە ئەو کتێبە دوو سەد و شازدە لاپەڕەیە، بەڵام بە ناونیشان و بە ناوەڕۆك و مانا هەزاران جار گەورەترە.

سەرەتای ساڵی 1989 عەزیز نەسین کتێبی بێ ئەندازە بەهاداری (تورکی بەلغاریا و کوردی تورکیا)ی بڵاوکردەوە. بەرهەمی نوێی عەزیز نەسین بریتییە لە پوختەی بیروڕای بەرانبەر کوردی تورکیا و بەسەرهاتی موحاکەمەی لەسەر ئەو وەڵامی پرسیارەی کاتی خۆی گۆڤاری "بەرەو ساڵی دوو هەزار" بڵاوی کردبۆوە. جگە لە وتارە بڵاوکراوەکانی دەربارەی تورکی بەلغارستان. وەك یەك ئاوڕدانەوە لە دوو لایەنی زۆرلێکراو. یەکێکیان هاوخوێن و رەگەز و ئەویتریان هاونیشتمان. بەڵگەی گەورەی و سەروەری و بەرزی و دووربینی و وردبینی و عەقڵ و فامی ئەو مرۆڤە بەڕاستی دەگمەنەیە کەوا لە پیاو دەکات تاریکبین نەبێ و دڵنیا دڵی بە دوارۆژی دونیا خۆش بێ کە بە پێی بۆچوونی دانتێ دەبێ جڵەوی کار بە دەست پیاوی بەراستی زیرەك و لە خۆبوردووی وەك عەزیز نەسینەوە بێ.

جا بڕایینە با چەند دێڕێکیش لەسەر تورکە هاودەردەکانی بەلغارستانیش بنووسین.

وەك ئاشکرایە هۆزە کۆچەرە تورکەکان لە سەدەی یازدەوە لە ئاسیای ناوەند و ئێرانەوە روویان کردە ئەنەدۆڵ، ئا ئاسیای بچوك، دوای ئەوەی لەم ناوچەیەدا جێگیر بوون و دەسەڵات و دامودەزگای خۆیان دامەزراند، لە ناوەندەی سەدەی چوارەمینەوە بەرەو نیمچە دوورگەی بەڵکان، کە بەلغارستان بەشێکێتی، کشان. دووبەرەکی دەربەگی بووە هۆی کەوتنی رژێم و دەسەڵاتی گەلانی بەڵکان، کە بەو هۆیەوە وڵاتیان کەوتنە ژێر رکێفی بە دەسەڵاتی عوسمانییەوە.

بەدەم ئەم رووداوانەوە بەشێك لە تورکە عوسمانییەکان روویان کردە ناوچەکانی نیمچە دوورگەی بەڵکانی نزیك تورکیا و لەوێ نیشتەجێ بوون و لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی عوسمانی لەو بەشەی ئەورووپادا دەوروبەری پێنج سەدەی خایاند تەواو خۆیان گرت و بوونە خاوەن زەوی ز زار و تەخت و بەختی خۆیان.

**دوای رزگاربوونی گەلانی بەلکان و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان، ئەو تورکانە مانەوە، چونکە لە هەموو روویەکەوە بوونە بەشێك لەو گەلانە. ئێستەیش ژمارەی ئەو تورکانە لە یۆنان لە سەد هەزار تێدەپەڕێ. لە یۆگۆسلاڤیایش دەگاتە دووسەد و پەنجا هەزار کەسێك.**

**ژمارەی تورکی بەلغارستان لە ملیۆنێك تێدەپەڕێ. بەشی هەرە زۆریان نیشتەجێی ناوچەکانی باکوری-رۆژهەلاّت و باشوری ولاّتن. هەموویان بە ئاین موسوڵمانن. شایانی باسە زۆربەی قەرەجی بەلغارستان و بەشێکیش لە بەلغارەکان کە بە رەگەز لە سلاڤەکانی باشورن، بوونەتە موسوڵمان. بەلغارە موسوڵمانەکان دانیشتووی ناوچەی رۆدەپاخی سەر دەریای ئیجە و ناوەندی مەکەدۆنیا و باکوری رۆژهەلاّتی بەلغارستانن.**

**دوای ئەوەی بەر لە سەدەی رابردوو بەلغارستان لە دەوڵەتی عوسمانی جیابۆوە، زۆربەی هەرە زۆری ئەو تورکانە لەوێ مانەوە، زۆر بە داخەوە ماوەیەکە کاربەدەستانی ئەو وەلاّتە ئەوروپاییە دەیانەوەی بە زۆری زۆردارەکی مافە رەوا مێژووییەکانی ئەو تورکانە زەوت بکەن. کار گەیشتووە بەوەی بە زۆر دەستیان لە ناوی نەتەوەیی خۆیان پێ هەڵبگرن.**

**هەڵبەت رەفتارێکی وا ناڕەوا رقی هەموو مرۆڤێکی خاوەن هەست هەڵدەستێنێ. چ جای نووسەرێك مرۆپەروەری وەك عەزیز نەسین. دیارە ئەنقەرەیش بە گەرمی لەسەر تورکی بەلغارستا هاتۆتە دەنگ. سەیر ئەوەیە لە گێژاوی ئەم بێنە و بەرەیەدا، بەلغارەکانی کوردی تورکیایان بیرکەوتۆتەوە بە کوڵ (بۆ) چاوی رەشیان دەگرین. دەڵێن ئێزگە و چاپەمەنی سۆفیا لەم بوارەدا تۆز دەکات و پاش شەست و پێنج سالاّن بە خێرێ تازە کەوتۆتە شین و شەپۆر و قوڕپێوان بۆ ئێسك و پروسکی پیرۆزی شێخ سەعیدی پیران و هاوبیرانی.**

**هەر خوار بکات زوو دەست هەڵنەگرێ!**

**کوردی قوڕبەسەری تورکیا ئاتاجی  هەڵوەستی وا هەلپەرستانە نییە. ئەو عەودالّی دوو کرداری پیاوانە و رەسەنی وەك کردارە بەرزەکانی عەزیز نەسینی گەورە و سەروەرە، کە لە یەك کاتدا و وەك یەك لە (تورکی بەلغارستان و کوردی تورکیا) گالّە بە کورتبینی فەرمانڕەوایانی هەردوو ولاّت دەکات. ئەوانەی لە دوو رێگەی جیاوازەوە لە یەك گەرووی تەنگەبەری پڕ شەرمەزاریدا یەك دەگرنەوە.**

**لە (تورکی بەلغارستان و کوردی تورکیا)دا، عەزیز نەسین بە گەرمی داوای جێبەجێکردنی مافە رەواکانی کورد دەکات. لەو کتێبەیدا دەڵێت:"ئێمەی تورك گەر بە ڕاستی ڕێزی خۆمان و نەتەوەمان دەگرین، پێویستە رێزی نەتەوەی کوردیش بگرین." بەرهەمی نوێی نووسەری گەورە هەرایەکی سەیری لە ناو روناکبیران و سیاسەتکاراندا ناوەتەوە. هی وایان هەیە پێی هار و هی وایشیان هەیە پێی شاد بووە. عەزیز نەسینی گەورە و سەروەر، خودا دەست بە بالّتەوە بگرێ و تا دێت لە وێنەت زۆر بکات.. ئامین، ئامین!**

**سەرچاوە سەرەکییەکانی ئەم وتارە:**

1. **چەند دیدەنییەك لەگەڵ هاوڕێ و برا و دۆستی کورد د. ئیبراهیم داقوقی.**
2. **ژمارەیەك سەرچاوەی ئەنیسکلۆپێدیایی.**
3. **تورکیای هاوچەرخ، بە زمانی روسی، مۆسکۆ** 1965
4. **عەزیز نەسین، داستانی ژیانی خۆم. "بیرەوەرییەکانی دوورخراوەیەك"، وەرگێڕانی عەبدولاّی حەسەنزادە. بەغدا** 1979.

5. عەزیز نەسین، وحش تۆرۆس، ترجمه جۆزیف ناشف، مراجعه و تقديم الدكتور أبراهيم الداقوقى، فى سلسله (من المسرح العالمى)، الكويت، العدد 196، اول يناير 1986.
6. عەزیز نەسین، أفعل شيئا يامت، ترجمه جۆزیف ناشف، مراجعه و تقديم الدكتور أبراهيم الداقوقى، فى سلسله (من المسرح العالمى)، الكويت، العدد 197، اول فبراير 1986.

# وتارەکانی محەمەدی مەلا کەریم لە وەڵامی وتارەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەددا

## بە داوێنی هەندێ بە بۆچوونەکانی دوکتۆر کەمال مەزهەرەوە لە وتارە سێ ئەڵقەیی یەکەیا لەمەڕ عەزیز نەسین

1

**محەمەدی مەلا کەریم**

لام وایە ئەگەر لە مەیدانی بیروڕادا دەرد هەبێ لە دەردی نەبوونی ئازادی و دیمۆکراسی قورستر و گرانتر بێ، دەردی ژێر پێ خستن و شاردنەوەی ڕاستی یە لەبەر خاتری دۆستان و دڵ نەیەشانیان، لە کاتێکا کە ئەو دۆستەی ئەو ڕاستی یەی بە خەیاڵی خۆت بۆ سوود و مەسڵەحەتی ئەو ژێر پێ ئەخەی، مەسڵەحەتی ڕاستەقینەی – بەتایبەتی ئەگەر لەو جۆرە کەسانە بێ بەو دوای ڕاستیدا ئەگەڕێن-  لەوەدایە کە ڕاستی یەکەی پێ بلێی، هەر ئەوەندە و تۆ خۆت بە باوەڕی خۆت لات ڕاست بێت. جا ئەگەر لە ڕاستیدا ڕاست نەبوو، ڕێگا لە ڕاستکردنەوەی هەڵەت نەگیراوە و، ئەو خۆی یا ڕۆژگار ئەتوانن بۆت دەرخەن کە تۆ بۆ خۆت بە هەڵە چووبووی نەك ئەو.

دکتۆر کەمال مەزهەر دۆستێکی دێرینی گیانی بە گیانیمە. ناسیاویمان ئەگەڕێتەوە بۆ یەکەم ساڵی پاش شۆڕشی نەمری 14ی تەمووز. کاتێ کە من بەرپرسی بە چاپ گەیاندنی گۆڤاری "هیوا" بووم، وتارێکی بە ناوونیشانی "نەورۆزی ساڵی 1959 لە بەغدا" هێنا بۆ هیوا و بۆم بڵاوکردەوە2. بەڵام چەسپانی ناسیاویمان و وەرگەڕانی بە دۆستایەتیی یەکی وا کە تا ئێستا بە دڵ و شانازیی پێوە ئەکەم پاش گەڕانەوەی لە یەکێتی سۆڤیەت و پێکەوە کارکردنی هەردوکمان بوو لە کۆڕی زانیاری کوردەوە دەست پێ ئەکا.

ئەگەر دەربڕینی بیروڕا و بە خەیاڵی ئینسان خۆی وتنی ڕاستی ئەرکێکی پێویستی سەرشانی هەموو مرۆیەکی بەشەرەف و خاوەن هەستی دڵسۆزی بەرانبەر بە گەل و نیشتمان و مێژوو و ڕاستیی مێژوویی بێ، ئەوە، زیاد لەوەیش، بەش بە حاڵی کەسێکی وەك من و بەرانبەر بە هەموو دۆستانم، نەخوازەڵا کەسێکی وەك دکتۆر کەمال، ئەرکێکی دووبارە ئەرکە.

دکتۆر کەمال هەرچی ئەنووسێ من دەسبەجێ پاش بڵاوبوونەوەی ئەیخوێنمەوە و، زۆر جاریش پێش بڵاوکردنەوەی خۆی پیشانم ئەدا. بیروڕا لە ناوخۆمانا ئاڵ و گۆڕ ئەکەین و منیش چیم بە لاوە ڕاست بێ لەو ڕووەوە، پێی ڕائەگەیەنم. وایش بووە مەسەلەکە گەیشتووەتە ڕادەی خستنە سەر قاقەزی، وەك لە وەرگێڕانی کتێبی (کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا)دا کە لە کوردی یەوە کردم بە عەرەبی، لە شوێنێکا هەندێ سەرنجی تایبەتیی خۆمم بەرانبەر بە بۆچوونێکی ئەو دەربڕیوەو، وەك ئەڵێن بەرپەرچی بیروڕایەکیم لە پەرازێزدا داوەتەوە3. هەروا وەك پاش دەرچوونی کتێبی (مێژوو)ەکەی لە گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان)ا لە سەریم نووسی و چەند ڕەخنەیەکم لە یەك دوو بابەتی گرت4. کە وتارە سێ ئەڵقەیی یەکەی ئەم دوایی یەیشی

نووسی و دای بە رۆژنامەی (هاوکاری)، بە تەلەفۆن لێی پرسیم: دیوتە؟. ئەو، چونکە سروشتی کاری من لە هاوکاریدا ئەزانێ5، لای وابوو پیشانم دراوە. کە بە (نەئـ) وەڵامم دایەوە، پێیشم وت: وەنەبێ هەموو جۆرە بابەتێکم بدرێتە دەست، چونکە سکرتێری نووسین بە بیروڕای خۆی ئەزانێ چ بابەتێ پێویستی بە هەڵسەنگاندن و پیاچوونەوەیە و چ بابەتێ نا، کە بڵاوکرایەوە ئەیخوێنمەوە. بەم جۆرە ئەڵقەی یەکەمیم بە بڵاوکراوەیی و ئەڵقەی دووەمیم بە پرۆڤەیی و، ئەڵقەی سێهەمیشیم هەر بە بڵاوکراوەیی خوێندەوە.

ئەڵقەی یەکەم و دووەمی وتارەکەم بێ گرێ و گۆڵ بەسەردا تێپەڕی. بەڵام لە ئەڵقەی سێهەمیدا هەستم کرد هەندێ باری سەرنجی جیاوازم لەگەڵ هیی دوکتۆر کەمال هەیە و، ئەبێ بە پێی ئەو باوەڕەم کە پێشتر باسم لێ کردو، بە گوێرەی ئەوەی د. کەمال دۆستێکی گیانی بە گیانیمە و ئەبێ هەرچی بەرانبەر بەو بە ڕاست بزانم، لەوەی بەرانبەر بە کەسێکی تر بە راستی بزانم زووتر پێی بڵێم، ئەم چەند دێڕە نووسینە سەریان هەڵدا و، ئەبێ ئەوەیش بڵێم کە کاک کەمال خۆیشیم لێ ئاگادار کردووە و، ئەویش، وەك زانایەکی ڕاستەقینە و پێڕەوی کەری ڕێگای دەمەتەقێ بۆ گەڕان بە دوای راستیدا بە سنگێکی فراوانەوە گوێی بۆ شل کردم.

بەر لە هەرچی لەم بەشی سێهەمەی وتارەکەی کاک کەمالدا هەست بە چەردەیەك جڵەو بەردان بۆ سۆز و تەراکەوتن لە ڕێبازی زانستی ئەکەم کە ئەوەیش بە زیادەڕەوی و دوورکەوتنەوە لەوە ئەزانم کە پێی ئەڵێن "مەوزووعیەتی زانستی". کاک کەمال کە لە سەرەتای ئەم بەشە چڕ و پڕەی وتارەکەیا (یەکەم پارچەی وتارەکەی لە لاپەڕە 6ی ژمارە 1123ی هاوکاریدا) ئەڵێ: "ڕاستە لە سەرانسەری هەموو جیهاندا مرۆڤێکی ڕێك و پێك هەڵناکەوێ لە فولاییی دڵەوە رقی لە جەور و ستەم و زۆردار و زۆرداری نەبێ، بەڵام ڕەنگ بێ شەپۆلی ڕەوای ئەو رقە پیرۆزە لە دەروونی کەسدا بە ڕادەی عەزیز نەسین پەنگی نەخواردبێتەوە.."، بەر ئەمە ئەکەوێ کە ئێستا وتم. ڕاستە کاک کەمال سەرەتای ئەم حوکمەی بە "رەنگ بێ" دەست پێ کردووە و، هەروا ڕاستە ئەم جۆرە زیادەڕەوی یانە لە نووسیندا و بە تایبەتی لە نووسینی ئەدەبیدا بووە بە باو، بەڵام بە هەر حاڵ ئەوەیش – هەر هیچ نەبێ بە لای منەوە- ڕاستە کە ئەمە زیادەڕەوی یە و، زیادەڕەوی یش کاری زانای هیچ بوارێکی زانست نی یە. من لام وایە ئەبوو کاک کەمال لەم مەیدانەدا شتێکی وەك ئەم رستەیە بڵێ: عەزیز نەسین یەکێکە لەو بنووسانەی شەپۆلی ئەو ڕقە پیرۆزە بە شێوەیەکی زۆر بە گوڕم و توند و تیژ لە نووکی قەڵەمیانەوە سەرئەکا.

کاک کەمال لە وتارەکەیا بڕگەیەك لە بارەی عەزیز نەسینەوە لە سەرچاوەیەك ئەگێڕێتەوە (بڕگەی حەوتەمی ستوونی یەکەم) بە "دروشمی سەربەستی بیروڕا لە تورکیا و نمونەی نووسەری مرۆپەروەری خەباتگێڕ لە جیهاندا"ی تیا ناو ئەبا. ئەمە هەرچەند وەسفی یەکێکی ترە بۆ عەزیز نەسین، بەڵام مادەم کاک کەمال خستوویەتیە ناو نووسینی خۆیەوە، وا ئەگەیەنێ بە هەڵسەنگاندنی وا قایلە. من ئەمەیشم هەر بەلاوە زیادەڕەوی یە و زیادەڕەوی یەکی گەورەیشە. بێ گومان عەزیز نەسینم لا زۆر خۆشەویست و پایەبڵندە و هەر بەرهەمێکیم بە کوردی یا عەرەبی یا فارسی دەستگیر ببێ ئەیخوێنمەوە. هەر لە ڕێگای بەرهەمەکانیەوە و لە ڕێگای ئەو زانستە کەمەوە کە لە بارەی ژیانیەوە هەمە ئەتوانم ئاوای هەڵسەنگێنم کە "نمونەی بنووسی ڕەخنەگری کۆمەڵایەتی و سیاسی یە لە دژی هەڵسوکەوتی ناڕاست و دروستی کاربەدەستانی وڵاتەکەی و دەس و پێوەندانیان، کە هەر ئەمەیشە جار و بار ڕایکێشاوە و ڕای ئەکێشێ بۆ بەشداری کردن لە سیاسەتا بە واتا زەقەکەی و تووشی گیروگرفتی کردووە و ئەکا. هەرچی دروشمی "نمونەی سەربەستی بیروڕا لە تورکیا"کەیە ئەتوانرێ لەگەڵ کەمێ چاوپۆشیدا بە باڵای عەزیز نەسین ببڕێ، بەڵام "نمونەی مرۆپەروەری خەباتگێڕ"

گەلێك بە گەورەتر ئەزانم لەوەی بەبەری بکا. ئەمە بە باڵای ئەدیبێکە لە ڕێگای نووسینەوە لە وڵاتێکی دیمۆکراسی بە تەواوی تیا پێشێل کراوی، وەك تورکیای تا ئەم دوایی یەی عەزیز نەسینا، ئازار و سزایەکی زۆر و بێ ئامانی دیبێ، وەك ئەوەی نازم حیکمەت و ئەدیبە پێشکەوتخوازەکانی تری ئەوێ دیبان و ئەوەی خەباتگێڕە کوردەکان لەوێ دیویانە و ئەیبینن. بۆیە پێم خۆش نەبوو کاك کەمالی خۆشەویستم هەرچەندە عەزیز نەسینیشی زۆر خۆش بوێ و، بە تایبەتی کە ئێستا ئەرکی داکۆکی لێ کردنی مافی مرۆوایەتی کوردیشی خستۆوەتە ئەستۆی خۆی، ئەم کاڵا بە قەد و باڵا نەشیاوە کە بەرگدروویەکی زیادەڕەو بۆ دووروبوە، ئەویش بێ قۆڵی بۆ تێهەڵکێشێ.

لە مەیدانی قەدرزانینی داکۆکی کردنێکی ئەم دوایی یەی عەزیز نەسیندا لە کوردی وڵاتەکەی، کاك کەمال قسە ئەگەیەنێتە بەراورد کردنێك لە نێوان عەزیز نەسین و نازم حیکمەت و بنووسە پێشکەوتخوازەکانی تورکیادا (برگەی حەوتەمی ستوونی یەکەم) و، ئەڵێ: "ئێمە هەمیشە گلەیی ئەوە لە نازم حیکمەت و نووسەرە پێشکەوتخوازەکانی تورکیا دەکەین کە دەرد و ئازاری بێ ئەندازەی برا کوردەکانیان جارێك نەیبزوادوون، هەرچەندە ئەو دەرد و ئازارە کێو لە بن دێنێ. نازم حیکمەتی خوالێخۆشبوو بە کوڵ بۆ ڕەش پێستانی ئەمەریکا و زۆرلێکراوانی هەر چوار گۆشەی جیهان دەگریا لە کاتێکدا ژیانی زۆربەیان گەلێك لە ژیانی کوردی تورکیا باشتر بوو. با ئەوەیش لە یاد نەکەین کە دەرفەتی نازم حیکمەت بۆ بزواندنی ئەو جۆرە باسانە گەلێك لە دەرفەتی عەزیز نەسین لەبارتر و زیاتر بوو، چونکە ئەویان بەشی زۆری ژیانی لە دەرەوەی وڵاتە بردەسەر و لە زۆر لاوە و بە گەلێك زمان دەرکەی بڵاوکردنەوەی بۆ ئاواڵە کرابوو بێ ئەوەی لە گرتن و ڕاوەدوونان بترسێ".

بۆ ئەوەی ئەم مەسەلەیە بخەمە چوارچێوەی ڕاستەقینەی خۆیەوە ئەبێ بڵێم دوو ڕوو هەیە بتوانین نازم حیکمەتیان لێوە بخەینە بەر لێپرسینەوە و داوەری لەم بارەوە.، یا لەو ڕووەوە کە سەر بە ئایدۆلۆژیایەکە ئیددیعای لایەنگری گەلانی ژێردەستە و ستەم لێکراوی جیهان ئەکا و داوای یەکگرتنی چەوساوانی گێتی دروشمیەتی، کە ئەمەیش واتە خستنە بەر لێپرسینەوە و داوەر کردنی ئایدۆلۆژییەکە، یا لەو رووەوە کە هونەرمەندێکی مرۆڤایەتی یە کە ئەمەیان خودی خۆی ئەگرێتەوە. ئەگەر لە رووی یەکەمەوە بۆ مەسەلەکە بچین ئەبێ بلێێن بەم پێیە نازم خۆی لە هیچ بەرپرس نییە و هەڵوێست چاك بێ و خراپ بێ ئەو ڕێبازە بەرپرسە لێی کە گرتوویەتییە بەر و ئەو ئایدۆلۆژیایەی بۆ خۆی پەسەند کردبوو لە ژیانا. لێرەدا پاش هێنانەوە بەرچاوی بار و دۆخی ئەو سەردەمەی کە کەم و زۆر سەرانسەری ماوەی ژیانی نازم ئەگرێتەوە، ئەگەینە ئەوەی کە پێویستە چەند ڕاستییەك ڕەچاو بکەین. یەکەم ئەوە کە بزوتنەوەی کورد لە تورکیادا بەرانبەر بە ڕژێمێك بوو لەسەر بنەمای بەرەو رووبوونەوە و بە گژاچوونی ئیمپریالیزم و داگیرکەرانی تورکیا هاتبوە رووی کار و لەسەر ئەمە پشتیوانیی سەرانسەری جیهانی ئازادیخوای بۆ خۆی دەستەبەر کردبوو، ئەمە لە لایەکەوە. لە لایەکی تریشەوە، لە سیاچارەیی کورددا، سەرکردایەتیی بزوتنەوەکەی بە دەستی کەسانێکەوە بوو هەندێکیان ئایدۆلۆژییەکی ئایینی و سۆفیانەی بە کۆنەپەرست دراوە قەڵەمیان هەبوو لە تورکیای نوێی عەلمانیدا و تەنانەت بە لایەنگری خەلافەتی رزیو و کۆنەپەرستی عوسمانی دائەنران. بەرانبەر بە ڕژێمێکی کۆماریی تازە بابەت و، هەندێکیشیان دەرەبەگی پاشکەوتوو بوون لە بەرانبەری بۆرژواو وردە بۆرژوازی شۆڕشگێڕ و، بە هۆی بەرەوڕووبوونەوەی تورکیای نوێوە لە لایەن ئیمپریالیزمی ئەورووپاوە کەم و زۆر جۆرە دەست تێوەردانێکی ئیمپریالیستەکان لەو بزوتنەوەیەی کورددا لە بەرچاو بوو، کە هەموو ئەمەیش کۆسپ بوو لە ڕێی تێگەیشتنی بە دادیی مەسەلەی کورد و لەسەرکردنەوەیا، بەڵکو، بە پێچەوانەوە، ڕێگای بۆ

گوناهبارکردنی تەخت و ئاسان کرد. دووەمیش بزووتنەوەی کرێکاری بە هۆی داسەپانی سەرکردایەتی و بیروباوەڕی ئاسۆ تەسك و دیکتاتۆریانەی ستالینیزمەوە، چ لە یەکێتی سۆڤیەت و چ لە هەر لایەکی جیهانا کە لقێکی تازە پەیدابووی ئەم بزووتنەوەیە بووبێ، تووشی دەردی کپ کردنی بیری ئازاد و داخستنی دەرگای لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و فەرمان سەپاندن و مەڵبەند پەرستییەکی وشکی دوور لە هەموو وردبوونەوە و لێکدانەوە و دوگماتیزمێکی کوشندە بووبوو، هەر کەس لە ئاستیا سەری هەڵبڕیایە و ناڕەزایی پیشان دایە، بە خۆفرۆشتوو نۆکەر و خەفیە و دوژمن و ناو و ناتۆرەی چەپەڵی لەم بابەتانە تاوانبار ئەکرا و، ئەگەر سەریشی تیا نەچوایە بە جۆرێ بەدناو ئەکرا لە هیچ کۆلانێکا گا بە دەنگی نەڕوا و، یا ئەبوو بیدایەتە پاڵ ئۆردوگای دوژمن و یا سەری خۆی کز کردایە و تا سەری یەکجاریی ئەنایەوە بێ دەنگ و کپ دانیشتایە. لە ئەنجامی ئەم وەزعەوە بە چاوێکی دوگمایانەی قوڵ رۆنەچوە خوارەوە سەیری زۆر مەسەلە ئەکرا و، بارودۆخێکی وا خوڵقا بوو مەسەلەی کوردیش لە لایەن بزوتنەوەی پێشکەتخوازی جیهانەوە، وەك مەسەلەی گەلێکی ستەم لێکراو و سەیری نەکرێ و بە یاخی گەرییەکی کۆنەپەرستانە و ئاینی بناسرێ. ئەم بارە ناخۆشە بەش بە حاڵی نازم حیکمەت هەموو سالانی چوونی دووەمی بۆ مۆسکۆ و گەڕانەوەی بۆ تورکیا و گیرانی و چوونە بەندیخانەی و پاشان بەرەڵلاکردنی و چوونی سەرلەنوێی بۆ مۆسکۆ و تا مەرگی لەوێ، کەم و زۆر، ئەگرێتەوە. کەواتە لە حاڵی وادا کەس مافی گلەیی لە نازم نییە ئەگەر لە بەدادیی مەسەلەی کورد نەگەیشتبێ و لەسەری نەهاتبێتە دەنگ. ئەوێ کە لە ژێر کەلەپچەی زیندانیشا تا ماوەیەکی زۆریش بەیت و بالۆرەی نیشتمانپەروەری (باوکی گەلی ولاتەکەی) بدرێ بە گوێیا، ئەبێ بە تەمای چ یارمەتییەك بین لێیەوە بۆ گەلێك لە بارودۆخێکی وەك ئەوەی ئێستا باسم کرددا لە رووی ئەو (باوك)ەدا راست بووێتەوە و ئالای شۆڕشی هەلگرتبێ. لە دواساڵەکانی ژیانیشیا کە وردە وردە تەمی دوگماتیزم و وشکەدەروێشی لە بزوتنەوەی کرێکاریدا کەوتبووە رەوینەوە و تا چەردەیەك ئازادی بیرکردنەوە و فرەڕایی خەریك بوو تیا پەیدا ئەبوو، زۆر لەوە بێ هێزتر بوو کۆتی ئەو بۆچوونە چەوتانەی کۆن بشکێنێ و کاری ماوەیەکی گەلێ زۆرتر و هەنگاوی گەلێ بە تینتری ئەویست. بەڵکو ئێستایش پاش حەفتا ساڵ هێشتا ئەو جۆرە سەرنجە لە زۆر شوێن و لای زۆر لا هێشتا حوکم فەرمایە.

خۆ ئەگەر لە رووی دووەمیشەوە بۆ مەسەلەکە بچین واتە رووی دەمی لێپرسینەوە بکەینە نازمی شاعیر و هونەرمەند و خاوەن هەست و کە مرۆی وا زۆر جار لە پیاوی سیاسی مرۆڤانەتر ئەڕوانێتە کاروبار و، تەنانەت ئەگەر خاوەت ئیلتیزامی سیاسییش بێ زۆر جار ئەو لایەنەی ئەو لەگەڵیەتی ناتوانێ زۆر توند رەخنەی لێ بگرێ و لێی بپرسێتەوە و چاو لە سەرکێشییەکانی ئەپۆشێ، ئەوە ئەبێ بڵێین لەم مەیدانەدا دوو شت هەیە، یەکەم ئەوەتەی نازم زۆر کەم راستەوخۆ وەك سیاسی دواوە و، لەگەڵ ئەوەیشا کە سەرجەمی کارە ئەدەبییەکانی خزمەتی ئامانجە مرۆڤایەتییە سیاسییەکانی ئەکەن، زۆر بە دەگمەن نەبێ ناوی هیچ کەسێ یا هیچ گەلێ ناهێنێ و کە داکۆکی ئەکا داکۆکی لە مرۆڤ و مرۆڤایەتی ئەکا و لە دژی خوێن مژین و چەوساندنەوە ئەدوێ و، تەنانەت بەشدار بوونیشی لە سیاسەتدا چ بە قەڵەم و چ بە هاوکاری لە ئاستی بالای ئەنتەرناسیوونالیستیا هەر لەو چوارچێوە ئینسانی یە گشتییەدا بووە و مەسەلەی هەر گەلێکی کردبێ بە بابەتی شیعرێکی لە دیدگای تراژیدیای یەك کەسی ئەو گەلەدا کردوویەتی و هەموو ئەمەیش لە قالبێکی ناسکی هونەریدا کە کەم کەس یەکەن دەردوو دەرك بەوە ئەکا لەو دیو ئەم بابەتە هونەرییەوە مەبەستێکی سیاسی خۆی حەشارداوە.

لە بارەی کورد و نازم حیکمەتەوە مامۆستا شوکور مستەفا ئەڵێ، لە حەوت بەرگ لە هەشت بەرگی تێکڕای بەرهەمی لە چاپدراوی نازم حیکمەتدا کە خوێندوویەتیەوە تەنها لە دوو شوێنا ناوی کوردی بەرچاو کەوتووە.

له شوێنێکیانا که باس له بڕوبیانوو گرتنی دەوڵەتی وڵاتەکەی خۆی ئەکا بۆ گرتن و ڕاوەدوونانی خەڵك و ئەڵێ مەسەلەی شێخ سەعیدیان کردووە بە بیانوو بۆ هەرچی کە بیانەوێ دەرهەقی ئەم خەڵکەی بکەن. واتای ئەم قسەیە دیارە کە داکۆکی یە لە کوردی خاوەنی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و لەو دیمۆکراتانەی وڵات کە دەنگی نارەزاییان لە داپڵۆسین و سەرکوت کردنەوەی کورد کردووە لەوێ.

لە شوێنێکی تریشا لە چوارچێوەی گەشتنامەیەکی خۆیا باس ئەکا کە لە ناو شەمەندەفەرا ئافرەتێك ئەبینێ ژنە پۆلیس ئەبێ، باسی ژیانی خۆی و مێردەکەی بۆ ئەکا، ئەڵێ: ناردینیانە ناو خەڵکێ پێیان ئەڵێن کورد، پێشتر پێیان وتبووین کلکیان هەیە. کە چویین دیمان نە کلکیان هەیە و نە هیچ و، ئەوانیش هەر وەکو ئێمە وابوون. واتای ئەمەیش ئاشکرایە کە ڕسواکردنی شۆڤێنییەکانی وڵاتەکەیەتی کە چۆن ناو و ناتۆرەی ناشیرین لە بارەی کوردەوە لە ناو خەڵکەکەدا بڵاو ئەکەنەوە و، چۆن ڕەشە خەڵکەکە تا سەر بەو درۆ و دەلەسانە ناخەڵەتێنن و، چۆن هەر کە ڕاستییان بۆ دەرئەکەوێ ئەچنەوە سەر ڕێی ڕاست.

کاك شوکور هەروا ئەیگێڕێتەوە کە لە میهرەجانی لاوان و قوتابیانی وارشۆی ساڵی 1955دا نازم حیکمەتی دیوە و ئەڵێ: یەکێ لە نوێنەرانی لاوانی کورد کە لە وەفدی عێراقدا ئەندام بوو، داوای کرد دەعوەتێك بە ناوی کوردانی بەشداری میهرەجانەوە بۆ نازم ڕێك بخەن و لە لایەن سەرۆکی وەفدی عێراقیشەوە پێشوازی لەم داوایە کراو، ئەو –واتە مامۆستا شوکور- نێردرا بۆ لای نازم بۆ بانگ کردنی. مامۆستا شوکور ئەڵێ: کە چووم بۆ لای نازم، نوسخەیەکم لە پارچە شیعرێکی عەبدوڕڕەحمانی شەرەفکەندی (هەژار) لەگەڵ خۆم بۆ برد کە بە بۆنەی میهرەجانەوە دانابوو. ئەڵێ کە دانیشتم لای، شیعرەکەم بۆ خوێندەوە و بۆم کرد بە تورکی، سەرەتای شیعرەکە بەم جۆرەیە:

کوردێکم ئەوێ چاپوك و پتەو
سەفەرێك بکا بە تاریکەشەو
نەیەڵێ تورك و عەجەم بزانن
داگیرکەرانن، لە کوردستانن

مامۆستا شوکور ئەڵێ: کە نازم گوێی لە تەرجەمەی ئەمە بوو، وتی، نا، تورك و عەجەم داگیرکەری کوردستان نین، فاشیستەکانی (تورك و عەجەم) داگیرین. ئەوجا دەعوەتەکەی قەبوڵ کردو بۆ ڕۆژی دووەم هات بۆ لامان و قسەی بۆ کردین و لە ناو قسەکانیا وتی: من میوان نیم، من خاوەنماڵم. من لەگەڵ براکانمم. من شیری کوردم خواردووە و بەشیری کورد پەروەردە کراوم. هەروا وتی میللەتی کورد و میللەتی تورك لە ناو خۆیانا هیچ گیرگرفتێکیان نییە، گیرگرفت لەگەڵ حوکومڕانانە و، لەم جۆرە قسانەی زۆر بۆ کردین. دەمڕاستی کوردەکان لە ناو وەفدی عێراقا بەو بۆنەیەوە قاتێ چۆغە و رانکی کوردیی پێشکەش کردو، ئەویش بە پێخۆشحاڵی یەکی زۆرەوە وەری گرت.

***

کاك ئەحمەد موحەممەد ئیسماعیلیش کە یەکێکە لە چیرۆکنووسە کوردە تورکی زانە بەدەرەوەکانمان و تەنانەت یەکێ لە بەرهەمەکانی نازم حیکمەتیشی کردووە بە کوردی، پێی وتم: کەوا جگە لەو هەشت بەرگە بەرهەمەی نازم حیکمەت کە لە بولگاریا بلاّوکراوەتەوە و وادانراوە سەرجەمی بەرهەمیەتی، پاشتریش هەندێ بەرهەمی تری تازە دۆزراوە لە بەرگێکدا بلاّوکراوەتەوە. لەو بەرگەیشیا لە چەند شوێنێکا باسی کورد هاتۆتە ناو کە لە یەکێکیانا باسی نامەیەکی تێکۆشێکی کورد ئەکا کە بۆ نازمی ناردووە و شانازیی خۆی بە هەڵوێست و تێکۆشانی قارەمانانەیەوە تیا دەربڕیوە.

لەمەیش هەموو بایەخدارتر ئەو دەسنووسەی نازم حیکمەتە کە لە ئەرشیفی کامەران عالی بەدرخانا بووە و پاش مردنی بەدرخان کوردێکی تورکیا بە ناوی (کەندالّ) بە کورتە پێشەکی یەکەوە لەگەڵ فۆتۆکۆپی یەکەی لە ژێر ناونیشانی (دەستنڤیسارێکی نازم حیکمەت لسەر کوردان) لە ژمارە (1)ی تشرینی یەکەمی 1983ی گۆڤاری (هیوا)ی پاریسدا بلاّوی کردووەتەوە. ئەو فایلەی بەدرخان کە ئەم دەسنووسەی تیا بووە، ساڵی 1961ی لەسەر نووسراوە. کەندالّ لە پێشەکی یەکەیا ئەڵێ:

ئیحتیماله ئەم دەسنووسە لە ساڵی 1961دا نووسرابێ. ئەم دەسنووسە کە لە (8) لاپەڕەی (5،13&21) سانتیمەتریدا نووسراوە، هەڵوێستێکی روونی پێشکەوتخوازانە و ئەنتەرناسیۆنالیستانەی بەرانبەر بە مەسەلەی گەلی کورد و پێوەندی بە گەلانی دراوسێ یەوە تیایە. هەمان بەڵگە بەوجۆرەی لە گۆڤاری (هیوا)دا بلاّوکراوەتەوە، پاش وەرگێڕانی بۆ سەر تیپی عەرەبی، لەگەڵ فۆتۆکۆپیی نووسراوەکەی نازمدا، لە لایەن سەعید دێرەشی یەوە، لەبەرگی دووەمی بلاّوکراوەی (دەنگێ مە)ی ساڵی 1985یشدا بلاّوبووەتەوە.

ئەمەم هەر بۆ ئەوە نووسی یەوە کە زۆر کوردی تریش قسەی وەك قسەکەی کاك کەمال ئەکەن و تەنانەت زۆریشیان ئەیکەن بە بەڵگە بۆ بەگژاچوونی سیاسیی دەستە و دائیرەی نازم و بۆ بانگهێشتنی دوورە پەرێزی لە گەلانی تر و بە تایبەتی گەلانی دراوسێ لە ناو کوردا. ئەگینا ئەگەر هەر هیچ بەڵگە و بەڵگەکاری یەکیش نەبێ لە ئارادا، عەقڵی هیچ لە سیاسەت گەیشتوویەك ئەوە ناگرێتەوە خۆی نازم حیکمەتی شاعیر و شانۆنامەنووس و هونەرمەند و تێکۆشی مرۆپەروەری سێزدە ساڵ زیندانی لە پێناوی گەلانی تورکیادا، هەڵوێستی دۆستی و هاودەردیی بەرانبەر بە گەلی کوردی وڵاتەکەی خۆی نەبووبێ، ئە\ینا ئەبێ جیاوازیی چی بێ لە نێوان ئەو و ئەوانەدا کە زیندانیان کردبوو؟!

ئەنجا ئاخۆ ڕاستە "دەرفەتی نازیم حیکمەت بۆی بزواندنی ئەو جۆرە باسانە گەلێك لە دەرفەتی عەزیز نەسین لە بار و زیاتر بوو، چونکە ئەویان بەشی زۆری ژیانی لە دەرەوەی وڵات بردە سەر و، لە زۆر لاوە و بە گەلێك زمان دەرکەی بلاّوکردنەوەی بۆ ئاواڵە کرابوو بێ ئەوەی لە گرتن و راوەدوونان بترسێ"؟

بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم ڕستەیەی کاك کەمال ئەبێ بڵێم بەش بە حاڵی نازم و نازمەکان مەسەلە مەسەلەی بوونی دەرفەت و بە ئازادی ژیان و نەترسان لە گرتن و راوەدوونان نییە، هەرچەندە ئەمەیش بایەخێکی ئێجگار زۆری هەیە، چونکە بوونی ئازادی و نەبوونی زەبروزەنگ دەرفەتی لێکۆڵینەوە و باش لێ حاڵی بوونی بار و دۆخ و کرۆکی رووداوەکان بە باشی دابین ئەکا، بە پێچەوانەوە بوونی ترس و لەرز و سەرکوت کردن و دەس بەستن و دەم دروونەوە، ئەگەر هەڵوێست دەربڕین لای نازم بە ئازادیی دەربڕینەوە بەند بوایە، ئەبوو لە مەسەلەی گەلی

وڵاتەکەیشی بێ دەنگ بوایە و خۆی نەخستایەتە بەر گێروگازی جەندرمەی ڕژێم و چەند جار و دواجاریان بۆ سیازدە ساڵ نەچوایەتە کونجی زیندانی تاریکەوە. ئەمانە چییان باوەڕ پێ بووبێ وتوویانە و کە یەکێکی بەرپرسیشیان ئەوە وەك ئەوە وایە هەموویان وتبێتیان و کەسیان نکوڵیی لەو وتراوە نەکردووە و، ئەگەر کردبێتی بە پاشگەزبوونەوەی لە رابردووی تا ئەو کاتە دانراوە.

کەواتە مەسەلە مەسەلەی باوەڕە. باوەڕیش لەم مەیدانەدا دوو لقی هەیە. باوەڕ بە شتێك و باوەڕ بەو تەکتیکانەی لە پێناوی هێنانەدی ئەو شتەدا ئەگیرێنە بەر. نازم حیکمەت، لام وایە کاك کەمالیش باوەڕی بەوە هەیە، لە پێناوی گەلی تورکیادا تێکۆشاوە. گەلی تورکیایش، وەك هەموو ئەزانین، هەر تورك نییە، کوردیشە، عەرەبیشە، ئەرمەنیشە، یۆنانیشە، لازیشە و لام وایە کەمایەتیی تریش هەن کە من پێیان نازانم. کەواتە تێکۆشانی نازم بۆ رزگاریی هەموو دانیشتوانی وڵاتەکەی بووە. ئەوەی کە ئەکرێ بە زەقی بە نازم و هاوبیرەکانی بووترێ ئەوەیە بۆ لەسەر شۆڕشەکانی کوردی تورکیایان نەکردۆتەوە؟ ئەمە پرسیارێکی بە جێ یەو وا من لێرەدا هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەدەم، ئیتر نازانم تا چەند راستی ئەپێکم.

نازم حیکمەت پێش گیرانە گەورە و دوور و درێژەکەی دوو ماوە لە یەکێتی سۆڤیەت ژیاوە، لە 1920ەوە تا 1924 و لە 1925ەوە تا 1927. لەو دوو ماوەیەدا و تا ماوەیەکیش لەوەپاش تورکیا بە وڵاتێکی شۆڕشگێڕ دراوەتە قەڵەم و دۆستی سۆڤیەت بووە و هەموو ئازادیخواهانی جیهان لایەنگری بوون و تەنانەت پێشکەوتخوازانی یۆنانیش دژی رژێمی وڵاتەکەی خۆیان لایەنی ئەویان ئەگرت و لەسەری ئەچوونە زیندان. بزووتنەوەی ئەو سەردەمەی کوردی تورکیایش —وەك پێشتریش وتمان- هەر بەم پێیە لە ریزی ئەو تەقەلایانەدا دائەنرا کە ئیمپریالیزم ئەیاندا بۆ گێڕانەوەی ڕەوڕەوەی مێژوو لە تورکیادا بۆ دواوە. جا کەسێکی وەك نازم حیکمەتیش، لەو سەردەمەدا، نە لە دەروونی خۆیا دەرفەتی لەسەر بزووتنەوەی کورد هاتنە دەنگ و رەخنەگرتن لە ڕژێمی وڵاتەکەی خۆیی شك بردووە و، نە ئەگەر شکیشی بردبێ لە سۆڤیەتێکی ئەوتۆدا کە بە هاوسەنگەری تورکیا دائەنرا ئەیتوانی ئاڵای نارەزایی لە سیاسەتی وڵاتەکەی بەرزبکاتەوە. پاشانیش کە ئیتر وردە وردە کۆنەپەرستیی رژێمی ئەو وڵاتە بۆ بزووتنەوەی پێشکەوتخوازی جیهانی دەرکەوت، ئەم دیاردە تازەیە هەرگیز ئەوەندە دیالێکتییانە نەبووە چاوگێڕانەوەیەکی بە هەڵوێستی پێشوودا بەرانبەر بزووتنەوەی کوردی تورکیا بەدەمەوە بێ. ئەم ماوەیەیش بە شێوەیەکی خەست و خۆڵ سەرجەمی ساڵانی پێش گیرانە سیازدە ساڵییەکەی نازم و ساڵانی گیرانی و پاش بەربوونی و چوونی بۆ سۆڤیەت و ژیانی لەوێ و تا مردنیشی لە حوزەیران (مانگی شەش-جون)ی 1963دا ئەگرێتەوە. نازم لەم ساڵانەدا، هەرچەند نیشانەی ئەوەیش هەیە کە لە دوا ساڵەکانیا تا چەردەیەك خۆی لە کۆتی دۆگماتیزم و رێبازی ستالینی رزگار کردووە، هەرچۆن بێ هەر لە ژێر تەئسیری، ئەگەر نەیشڵێین کوتەك، مۆرفینی ئایدۆلۆژیی ئەو وشکە دەروێشی یەدا بووە کە تێکرای بزووتنەوەی سۆشیالیزمی زانستی یانەی گرتبوەوە. کەواتە دەرفەت بەش بە حاڵی نازم حیکمەت دەرفەتی رەهابوونی بیرە لە کۆت و زنجیری دۆگماتیزم و سەرکوت کردنەوەی ناوخۆیی بیر، نەك کۆت و زنجیری پۆلیس و بەندیخانە کە هەرگیز نەیتوانیوە رێی یەکجاری لە هیچ وڵاتێکا لە هیچ نازم حیکمەتێ بگرێ.

هەرچی عەزیز نەسینە، کابرایەك لیبراڵ. خۆی بە غەیری خۆی و بۆچوونی خۆیەوە بە هیچی ترەوە نەبەستووەتەوە. بۆچوون و بەرژەوەندی خۆی —بە مانا گشتییەکەی- سەرچاوەی بیرکردنەوەیەتی. وڵاتەکەیشی لەم سێ چوار ساڵەی دواییدا کە ئەویان لەسەر کورد تیا هاتوەتە دەنگ، هەرچۆن بێ چەردەیەك لێبرالیزمی هەر تیا بووە. کەواتە دەرفەتی نازم و نەسین زۆر لێك جیان و، ئەمەیش —سێ بارە- ئەیلێمەوە بۆ داکۆکی نییە لە

کەس ئەوەندەی کە بۆ داکۆکییە لەوە کە هەر کەس ئەوەندەی تەکلیف لێ ئەکرێ کە لە دەسەڵاتیا بێ چ بە تێگەیشتن و چ بە کردن.

ئەنجا نازم حیکمەت بە کوڵ بۆ کەس نەگریاوە، نە ڕەش پێستانی ئەمەریکا و نەزۆرلێکراوانی هەر چوارگۆشەی جیهان –کە کوردیش ئەگرێتەوە-. ئەمە کاری ئەو نییە، کاری ئەو شاعیرانە هەر بە دروشم و دروشمکارییەوە خەریکن و بڵندگۆی سیاسی حیزبەکانیانن . نازم حیکمەت وەك هونەرمەندێکی وردی ناسك مەسەلەکان دێنێتە پێش و ئاهێکی نەگرفتە ئەگەر جارێ ناوی کەسێ یا لایێ بێنێ، مەگەر ناوی موعەززەزی ژنی و موحەممەدی کوڕی. نازم مەگەر لە چوارچێوەیەکی بەربلاوی مرۆڤانەی وەك باسی جەنگدا ناوی گەلێکی جەنگ زەدە یا دەوڵەتێکی دەسدرێژیکەر لە شیعریا بێنێ. کارەکانی نازم حیکمەت دیارە لە کرۆکا هەموو کاری سیاسین، بەڵام ئەوەندە هونەرمەندانە و مرۆڤانە نووسراون دووئاتەشەترین مرۆی کۆنەپەرست یارای ئەوەی نییە وەك شیعر و شانۆنامەی سیاسییان بداتە قەڵەم و لەو دیدگاوە بییانداتە دواوە، مەگەر لە کۆنەپەرستیدا شووڵی بێعاری لێ هەڵکێشا بێ و بە ڕۆژی نیوەڕۆ جاڕی کۆنەپەرستی خۆی دابێ.

بە راستی لە ناخی دڵمەوە پێم ناخۆشە خۆم بە ناچار ئەزانم لە بارەی ئەم بڕگەیەی وتارەکەی کاك کەمالەوە لەمەڕ هەڵوێستی نازم حیکمەت بەرانبەر مەسەلەی کورد بڵێم: ئەگەر چاو لە ڕاستی نەپۆشین، وا ئەگەیەنێ نازم حیکمەت، بەدەسەنقەست، نەك هەر دژی ئەو ئامانجە سیاسییانە بووە کە رێکخراوە کوردەکان تورکیا بۆ خۆیانیان داناوە، بەڵکو تەنانەت دژی رەشە خەڵکەکەی کوردیش بووە، کە هەرگیزا و هەرگیزیش، وەك مرۆیەکی ئینسان دۆست، لە دۆستێکی دڵسۆزی گەلی کورد و هەموو گەلێ کەمتر نەبووە.

کاك کەمال کەرتێکیشی لە بەشی سێیەمی وتارەکەی تەرخان کردووە بۆ تورکەکانی بولگارستان. لەم مەیدانەدا چەند بڕگەیەك لە نووسینەکەی کاك کەمال ئەگوێزینەوە بۆ ئێرە:

کاك کەمال لە سەرەتای ئەم بەشەی وتارەکەیدا (بڕگەی دووەمی ستوونی چوارەم) ئەڵێ: "سەرەتای ساڵی 1989 عەزیز نەسین کتێبی بێ ئەندازە بەهاداری (تورکی بولغاریا و کوردی تورکیا)ی بڵاوکردەوە. بەرهەمی نوێی عەزیز نەسین بریتییە لە پوختەی بیر و رای بەرانبەر بە کوردی تورکیاو ... تاد", پاشان ئەڵێ: "جگە لە وتارە بڵاوکراوەکانی دەربارەی تورکی بەلغارستان، وەك یەك ئاوڕدانەوە لە دوو لایەنی زۆر لێ کراو، یەکێکیان هاوخوێن و رەگەز و ئەویتریان هاونیشتمان، بەڵگەی گەورەیی و سەروەری و بەرزی و دووربینی و عەقڵ و فامی ئەو مرۆڤە بە راستی دەگمەنەیە کە وا لە پیاو دەکات تاریك بین نەبێ و دڵنیا دڵی بە دوا رۆژی دنیا خۆش بێ کە بە پێی بۆچوونی دانتێ دەبێ جڵەوی کار بە دەستی پیاوی بەراستی زیرەك و لە خۆبووردووی وەك عەزیز نەسینەوە بێ",

پێشەکی ئەبێ بڵێم کورد واتەنی لەم قوڕە ئەوەندە تۆز هەڵسێ و، لە وڵاتێکی وادا کە تا ئەم دواییەیش بە کوردی تیا ئەوترا (تورکی کێوی)، کورد لە ئاستی تورکی بولگاریایشدا دابنرێ هەر شوکرانە بژێری ئەوێ. ئەمە لە کاتێکا کە هەڵوێستەکە لە تورکێکی تورکیاوە بێ هەرگیز بە بیروباوەڕی ئەنتەرناسیۆنالیستی ناوی دەرنەچووبێ. بەڵام کاك کەمالی کوردی بە بیروباوەڕی پێشکەوتخواز ناسراو بێ هەڵوێستێکی وا بە ناوونیشانی "گەورەیی و سەروەری و بەرزی و دووربینی و عەقڵ و فام" دانێ و، خاوەنی هەڵوێستێکی وا بە پیاوی "دەگمەن" بداتە قەڵەم و، هەر لە بوونی پیاوێکی وا دەگمەنەوە دڵی بە دنیا ئەوەندە خۆش بێ بڵێ:"وا لە پیاو ئەکات تاریك بین نەبێ و دڵنیا دڵی بە دوا رۆژی دنیا خۆش بێ"، ئەوە لای من بە هیچ کلۆجێ مایەی شادمانی نییە.

**بەر لە هەرچی ئەزانم ئێستا هەندێ کەسی وا هەن ئەڵێن: من ئەم قسانەم تەنها بۆ داکۆکییە لە رژێمی بولگاریا و هیچی تر. بەڵام با سوور بیخەمە مشتی ئەوانەوە و بڵێم من لەگەڵ ئەوەیشا کە لە ڕووی راستی گێروگرفتی نێوان تورکەکانی بولگاریا و دەوڵەتی بولگاریا شارەزا نیم، بە هەموو هێزمەوە نارەزایی خۆم لە هەر زۆر بۆ هێنانێکی ئایینی یا نەتەوەیی یا بیروباوەڕی یا چینایەتی دەرئەبڕم کە دەوڵەتێك لە دژی کەسێك یان کۆمەڵە خەڵکێکی بەکاربێنێ، بەوەی بولگاریایشەوە و، بەڵکو لەوانەیە بڵێم ئەمە لە وڵاتێکی سۆشیالیستدا کە ئیدیعای باوەڕ بە هاوسانیی گەلانی گەورە و بچوك ئەکا گەلێ پێناخۆشترە تا لە وڵاتێکی دەرەبەگی یا سەرمایەداریدا کە ئەگەر شتی وایش بکا لە سروشتی خۆی نەچۆتە دەرەوە.**

**بەڵام ئاخۆ بە راستی ئەم دوو تای تەرازووە هاوسەنگن؟ ئاخۆ تورکی بولگاریا لە بەکارهێنانی زمانی خۆیان و لە بڵاوکردنەوەی کتێب و گۆڤار و رۆژنامە بە تورکی بێ بەشن؟ ئاخۆ رێیان لێ گیراوە داب و نەریتی ئایینیی خۆیان لە مزگەوتا جێبەجێ بکەن؟ ئاخۆ لەسەرەتای دامەزرانی رژێمی سۆشیالیستییەوە لە ژێر زەبروزەنگی حوکمڕانانان؟ ئاخۆ تا ئێستا سێدارە بۆ کەسیان هەڵخراوە و، هەزارانیان ساڵەهای دوور و درێژ لە زیندانا ڕزیون هەر لەبەر ئەوە کە تورکن؟ ئاخۆ لە ژێر نێڵەی دەرەبەگ و کۆتی سەرمایەدار و پۆستاڵی ژەندرمەدا ئەژین؟ دیسانەوە ئەڵێم من دژی هەر جەور و ستەمێکی ئایینی و نەتەوەیی و چینایەتی و بیروباوەڕیم لە هەر لایەکەوە بەرانبەر بە هەر لایەك.. باوەڕیشم بەوە هەیە دیمۆکراسی لە بولگاریا نە بەش بە حاڵی بولگارەکان خۆیان و نە بەش بە حاڵی کەمایەتییەکان، بە تورکیشەوە، بەوجۆرە نەبوە کە پێویستە لە وڵاتێکی سۆشیالیستی راستەقینەدا هەبێ مادەم سۆشیالیزم بۆ سوودی گەل هاتووەتە ئاراوە.**

**ئەنجا توخوا بەراست ئەم دنیا وا تاریك بووە کەسی تیا نەبێ لەسەر مافی گەلێکی ستەمدیدە بێتە دەنگ و مرۆ دڵی بە دنیا خۆش نەبێ و تەنها ئەم  چەند بەڕە کتێبەی عەزیز نەسین هەبێ ببێ بە دەسەچیلەی هەموو گەلانی جیهان بەرەو دوا رۆژی گەش؟ ئەی ئەو هەموو پێغەمبەر و حوکیم و فەیلەسووف و خاوەن بیر و خێرخواز و بەیانیی جیهانی مافی ئادەمیزاد و جاڕی مافی چارەنووسی گەلان و ناچاریی هەر بەرەو پێشەوە چوونی ڕەوڕەوەی مێژوو و، ئەو هەزاران شۆڕشگێڕ و لە خۆبووردوانەی ئەم ڕووی زەوییە چییان لێ هات کە چوونە کۆڕی خەبات و شۆڕش و چوونە سەر سێدارە و لەبەر ڕیزی گوللەی خوێنخۆرانا وەستان و چاوی ترسیان نەترووکاند و، ساڵەهای ساڵ شەو و رۆژی سارد و سڕ و تاریك و شێداری زیندانەکانیان بە کەلەپچەی قورسی دەست و پێوە لە پێناوی دوارۆژی مرۆڤایەتیدا بەسەر برد؟ ئەشێ ئەمە هەمووی هیچ بێ و تەنیا عەزیز نەسین پێغەمبەری ئاخر زەمان و بانگەوازی دادپەروەری بێ لە جیهانا.. ئەنجا لەگەڵ هەموو مەمنوونی و قەدرزانینێکما بۆ هەڵوێستی عەزیز نەسین لە ئاست گەلی کوردی تورکیا و خستنە بەرچاوی مەسەلەی ئەم گەلە لە کتێبەکەیا، ئەمەوێ بپرسم ئەم بنووسە کە چەند ساڵە خەڵك ئەیناسن، لەکەیەوە کوردی بیرکەوتووەتەوە و بەدەرکەوتنی ئەو ئەم دەرووی خێرە لە مرۆڤایەتی کرایەوە؟**

**کەواتە ئەبێ بێ ئەندازەیی بەهاداریی ئەم کتێبە لە کوێدا بێ؟**

**لەوەیدا کە ڕادەی چەوسانەوەی کوردی تورکیای ئەوەندە بە کەم پیشان داوە لە ئاستی چەوسانەوەی تورکی بولگاریادا بێ کە پێیان ئەڵێن ئێوە بولگارین و ئەبێ ناوی بولگاری هەڵگرن، یا لەوەدا کە چەوسانەوەی تورکی بولگاریای ئەوەندە بەرزکردوەتەوە گەیاندوویەتیە ڕادەی چەوسانەوەی کوردی تورکیا و وتوویە ئەوەی لە تورکیا بە کورد ئەکرێ هەر ئەوەیشە لە بولگاریا بە تورك ئەکرێ؟**

کاك کەمال لە بڕگەیەکی تری وتارەکەیا (بڕگەی هەشتەمی ستوونی چوارەم) ئەڵێ: " زۆر بە داخەوە ماوەیەکە کاربەدەستانی ئەو وەڵاتە ئەوروپاییە دەیانەوەی بە زۆری زۆردارەکی مافە ڕەوا مێژووییەکانی ئەو تورکانە زەوت بکەن. کار گەیشتووە بەوەی بە زۆر دەستیان لە ناوی نەتەوەیی خۆیان پێ هەڵبگرن". پاشان ئەڵێ: "سەیر ئەوەیە لە گێژاوی ئەم بێنە و بەرەیەدا، بەلغارەکانی کوردی تورکیایان بیرکەوتۆتەوە بە کوڵ (بۆ) چاوی ڕەشیان دەگرین. دەڵێن ئێزگە و چاپەمەنی سۆفیا لەم بوارەدا تۆز دەکات و پاش شەست و پێنج ساڵان بە خێرێ تازە کەوتۆتە شین و شەپۆر و قوڕپێوان بۆ ئێسك و پروسکی پیرۆزی شێخ سەعیدی پیران و هاوبیرانی. هەر خوار بکات زوو دەست هەڵنەگرێ! کوردی قوڕبەسەری تورکیا ئاتاجی هەڵوەستی وا هەلپەرستانە نییە. ئەو عەودالی دوو کرداری پیاوانە و ڕەسەنی وەك کرداره بەرزەکانی عەزیز نەسینی گەورە و سەروەرە، کە لە یەك کاتدا و وەك یەك لە (تورکی بەلغارستان و کوردی تورکیا) گاڵتە بە کورتبینی فەرمانڕەوایانی هەردوو وڵات دەکات. ئەوانەی لە دوو ڕێگەی جیاوازەوە لە یەك گەرووی تەنگەبەری پڕ شەرمەزاریدا یەك دەگرنەوە".

من لە کاتێکدا کە هیچ پشت بەوە نابەستم لەم گەرمەی کێشەی نێوان بولگاریا و تورکیادا، بولگاریا لەسەر کوردی تورکیا ئەکاتەوە و لەو هەلپەرستییە سیاسییە زۆر دلگرانم کە بە هیچ کلۆجێ لە سەرچاوەی باوەڕ بە مافی چارەنووس دیاریکردنی گەلانەوە هەڵنەقولاوە. لام وایە ئێمە، وەك کورد، هەر ئەوەندەمان بۆ ڕەوایە داوای دادان نان بە مافی تورکی بولگاریادا لە لایەن بولگاریاوە بکەین و پێشێلکردنی مافە نەتەوەییەکانیان بە تاوان دابنێین و، لەم جیهانەدا، کە بەداخەوە، تەنیا مەسڵەحەت حوکم فەرمایە تیایا هەرگیز سوود و مەسڵەحەتمان لەوەدا نییە گاڵتە بەو هەڵوێستەی بولگاریا بکەین کە لە ئاست گەلی کوردی تورکیا گرتوویەتیە بەر، چونکە مەبەستی هەر چی بێ و با بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ، لایەنی مەسەلەیەکی دادپەروەری گرتووە کە قازانجی ئێمەی تیایە و، وەك کەسانێکی پێشکەوتخوازیش تەنها ئەوەندەمان بۆ هەیە ئاواتی ئەوە بخوازین ئەم هەڵوێستە بۆ ئێمە بە سوودەی لە سەرچاوە لێڵە هەلپەرستانەکەیەوە بگوێزێتەوە بۆ سەرچاوەیەکی ئینسانی و ئەنتەرناسیۆنالیستی و، لە هەموو مەسەلەیەکی بەدادی تریشا چ خۆی و چ ئاوەڵەکانی ئۆردوگای سۆسیالیستی یشی هەڵوێستیان هەڵوێستێکی ئینسان دۆستانە و ئەنتەرناسیونالیستانە بێ و، هەر ئەمەیشە ڕێگای ڕاست و، هەر لەم ڕێگا ڕاستەیشەوە کارێك ئەکەن متمانە بە ڕاستگۆییان بکرێ و، بۆ خۆیشیان گەلێ لەو بارە قورسانەی سەرشانیان سووك ئەبێ کە زۆری لە ئەنجامی هەلپەرستی و لە دادپەرستی لادانەوە پەیدا بووە و بووە بە تەوق و چووەتە گەردنیان.

بێ گومان منیش و کاك کەمالیش و هەموو مرۆیەکی نیازپاکیش حەزمان ئەکرد و بە ئاواتەوە بووین ئەم کۆمەڵگای جیهانە ئەوەندە یەك ڕوو بوایە کەس ئاتاجی هەڵوێستی هەلپەرستانەی کەسی تر نەبوایە و، هەر دۆستێك بێ مەبەست و بێ ڕەچاوگرتنی قازانجی تایبەتیی خۆی دۆستایەتیی بکردایە و دوژمنیش زەق بیوتایە من دوژمن و پەنای نەبردایەتە بەر چاوبەست و فڕوفێڵ و دەست بڕین، بەڵام ئەفسوس جیهانەکە ئەو جیهانە نییە، جیهانی بەرژەوەندی تایبەتی پەرستنە. ڕاستە جیاوازییەکی زۆر و گەورە و گران لە نێوان ڕەوشت و هەڵوێستی لایەنەکانی کێشەی جیهانیدا لە گەلێ ڕووەوە هەیە و ڕەوشت و واقیع بینیش ڕێگەی ئەوە نادەن مرۆ هەموو لایەنەکانی کێشەکە بە یەك چاو سەیر بکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا ئەوەی ڕەوڕەوەی پێوەندی نێودەوڵەتان بەرێوە ئەبا ڕاستییە ڕووتوقووتەکە نییە، سوودی لایەنەکان خۆیانە و ئێمەمانان هەر ئەوەمان بۆ ئەمێنێتەوە کە سوودی (مەوزوعی)مان لە هەڵوێستی لایەکا بێ و، لەمە بەو لاوە هیچ شوێنێکی وامان لە حیسابی هیچ لایەکا نییە. ئەمڕۆ ئاوایە و، بۆ سبەینێیش خوا خۆی ئەیزانێ چۆن ئەبێ.

هەرچی کرداری پیاوانە و ڕەسەنی مرۆیەکی ئەدیب و هونەرمەند و ئینسان دۆستی وەك عەزیز نەسین و، کەسانێك و ڕێکخراوە و کۆمەڵانێکی تاك و تەرا و دەسەڵات نەبوویشە لەم گۆشە و ئەو گۆشەی جیهانا، ئەوە بێ گومان بڕی دنیایەك مەمنونینی، بەڵام لەم جیهانە ئاڵۆزەدا کە مەسڵەحەت بەڕێوەی ئەبا و هەر هێز ئەتوانێ باری لاری ڕاست کاتەوە، ئەوە بە زەحمەت ئەگەر بتوانێ چەردەیەك حاڵی کەسێ خۆش بکا و هەر ئەوەندەی لە بارایە بە گوێی بەدبەختانی تری جیهانیدا بدا کە لە فلانە وڵاتیشدا کەسانێکی سیاچارەی وەك ئێوە هەن، نەکەن دڵتان بۆ خۆتان دابمێنێ!

زۆری لەسەر ڕۆیشتم، بەڵام بە بێ هوودەیشی نازانم. عوزریشم ئەوەیە لەم بارودۆخەی ئەمرۆماندا کە زۆر شت ئاوەژوو کراوەتەوە و، هەلومەرجە پێویستەکانی ئاوەژووبوونەوەی گەلێ شتی تریش لە ژیانی ڕۆژانەی خۆماندا گەرای داناوە. بۆ ڕاگرتنی ئاستی هۆشیاریی جەماوەر کە بۆ پاشەوە نەگەڕێتەوە و شتێك هەبێ پاڵێکی بۆ پێشەوە پێوە بنێ، هەر تەنها بزووتنەوە خودییەکەی مێژوو پێویست نییە، کەسانی بزووتووی بزوێنیشمان پێویستە. جا ئەگەر یەکێ لەو کەڵەبنووسانەی مێژوومان کە هەم بزووتووی چالاك و هەم بزوێنی چالاکیش بێ وەك دوکتۆر کەمال مەزهەری دۆستی ئازیز و خۆشەویستمان، بیروبۆچوونێکی وای خستە ئاراوە، بەش بە حاڵی ئەوەی ئەوی پێ ناسراوە، "تازەیی"یەکی تیا بوو و پێویستی بە لێکۆڵینەوە و تاوتووکردن بوو، ئەبێ چ لەبەر سوودی خۆی و چ لەبەر سوودی جەماوەری خوێنەرەوانێ کە بەپەرۆشەوە بە دوای نووسینەکانیا ئەگەڕێن، لەگەڵی بکەوینە دەمەتەقێ و، ئەگەر، خوانەکردە، زەدەییەك لە شوێنێکا هەبوو هەروا تێنەپەڕێ و ڕاست بکرێتەوە و، خۆ ئەگەر وایش نەبوو و ئێمە باش لە مەبەستێکی حاڵی نەبووبووین، ئەو بتوانێ بیرەکەی خۆیمان بۆ ڕوون بکاتەوە و جەماوەری خوێنەرەوانی خۆی تێبگەیەنێ.

پەراوێز (ی نووسەر):

1. ئەم وتارە کە یەکەم جار لە دوو ژمارەی 1138 و 1139 ی ڕۆژنامەی هاوکاری-ی ڕۆژانی 25ی 12 و 28.12.1989 دا بڵاوکراوەتەوە، ئەوەیە کە دوکتۆر کەمال مەزهەر بە "وتارێکی بێ ناونیشان"ە پێنج ئەڵقەیی یەکەی وەڵامی داوەتەوە، کە ئەم کتێبەی لە وەڵامدا نووسراوە (مەبەست لە کتێبی "بە تەمای گفتوگۆیەکی دیموکراتی بووم، بووم بە کاکە حەمەی کورد"ی کاکە حەمەیە، کە ئێمە ئەم بەشەمان لێیوەرگرتووە. ئامادەکاران).

2. کەمال مەزهەر ئەحمەد: نەورۆزی ساڵی 1959 لە بەغدا، گۆڤاری (هیوا)، ژمارە 8، ساڵی 2، شوباتی 1959، ل 67-82.

3. الدكتور كمال مظهر احمد: كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة محمد الملا عبدالكريم، بغداد، 1977، مطبعة المجمع العلمى الكردى، ص 269-271.

4. محەمەدی مەلا کەریم: چەند تێڕامانێکی فەلسەفی لە کتێبی "مێژوو"ی دوکتۆر کەمال مەزهەردا، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژمارە 65، شوباتی 1984، ل 35-37.

5. لەو سەردەمەدا (محرری لغوی) بووم لە ڕۆژنامەی هاوکاری.

**سەرچاوە: کتێبی "بە تەمای گفتوگۆیەکی دیموکراتی بووم، بووم بە کاکە حەمەی کورد" نووسینی محەمەدی مەلا کەریم. چاپخانەی (الزمان-بەغدا) ساڵی** 1990.

**تێبینی: رێنووس دەستکاری نەکراوە، دەقەکە لە لای کاکە حەمە چۆن نووسراوە بەو جۆرە گوێزراوەتەوە.**

